# ناوەرۆك

## پێشکەشە:

* بە هەڵگرانی ئاڵای ئازادی و پارێزەرانی ئاشتی لە دونیادا.

* بە خانەوادەکەم.

* ئەلفرێد بێرنارد نۆبڵ.



## سوپاس و پێزانین:

یادگار فەرەج کاکی، سیروان تۆفیق کە ماندوبوون لەگەڵم بۆ ئامادەکردنی ئەم پەرتووکە.

## ئاماژەیەك

ئامادەکردنی ئـەم پەرتووکـە لـە پرسـیارێکی هـاوڕێی خۆشەویـستم (یادگـار فـەرەج)ەوە سەریهەڵدا، کە منی رووبەڕووی ئەو پرسیارە کردەوە (کێ یەکەم کەس بوو کـە خـەڵاتی نـۆبڵی ئاشـتی وەرگـرت). لێـرەوە گـەڕانی مـن دەسـتی پێکـرد بـۆ وەڵامدانـەوەی ئـەم پرسـیارە و نهێنییەکانی خەڵاتی نۆبڵ. پاش ماندوبوون و شەو نخونییەکی زۆر، توانیم بـە هاوکـاری چـەند هاوڕێیەکی دڵسۆز و خۆشەویست ئەم پەرتووکەی لێ ئامادە بکەم. دووبارە سوپاس بۆ یادگار و هەموو ئەو کەسانی کە ماندووم کردن.

# ئەم پەرتووكە

تا ئەو جێگایەی دەستم پێڕاگەیشتبێت، و توانیبێتم سەرچاوەی جۆراوجۆرم بەكارهێناوە بۆ ئامادەكردنی ئەم پەرتووكە. سوودم لە زمانەكانی (ئینگلیزی، عەرەبی، كوردی، فارسی) بە ڕێژەی یەكەم وەرگرتووە. ئەم پەرتوكە، پێكهاتووە لە خەڵاتی نۆبڵ، كە خەڵاتێكە لەسەر ئاستی جیهانیدا، و سەنگ و قورساییەكی گەورەشی هەیە بۆ هەڵگرانی ئەم خەڵاتە. كە لە ناوی (ئەلفرێد نۆبڵ)ی زانای سویدییەوە وەرگیراوە. بە پێی ئەو وەسیەتنامەیەیی لە شاری سان ڕیمۆی وڵاتی ئیتاڵیا لە پاش مردنی لە بەرواری ١٠ كانوونی یەكەمی ١٨٩٦ بە جێیهێشت. ئەم وەسیەتنامەیە لە بەرواری (٢٧ تشرینی دووەمی ١٨٩٥) لە پاریس دواجار نۆبڵ نووسیویەتی. ئەم پەرتووكە ژیان و كارەكانی نۆبڵ لەگەڵ سەرجەم بەشەكانی خەڵاتەكە لە خۆدەگرێت، كە لە ساڵی ١٩٠١ واتا پێنج ساڵ دوای كۆچی دوای نۆبڵەوە دەستپێدەكات، ئەمەش یەكەم ساڵی بەخشینی خەڵاتەكەیە، ئامادەمان كردووە. جگە لە خەڵاتی نۆبڵ بۆ زانستی ئابووری كە لە ساڵی ١٩٦٩ وە دەست بە بەخشینی دەكرێت. ئەم خەڵاتە لەلایەن بانكی ناوەندی سویدییەوە بۆ یادی ئەلفرێد نۆبڵ و یادی ٣٠٠ ساڵەی دامەزراندنی خۆی ئامادەكراوە، خەڵاتەكە شەش بەش لە خۆدەگرێت كە ئابووری لە وەسیەتنامەكەی نۆبڵدا نییە، پاشان بۆی زیادكراوە، بەشەكان بە پێی ئەوەی كە لە وەسیەتنامەكەیدا ریزبەندكراوە ئێمەش لەم پەرتوكەدا ریزبەندمان كردووە. بەم شێوەیە (فیزیا، كیمیا، نوژداری، وێژە، ئاشتی) پاشان ئابووری. لەم پەرتووكەدا زانیاری سەرەتای لەسەر هەریەك لە براوەكانی ئەم خەڵاتە بەدەستەوە دراوە، و لایەنە بەرپرسەكانی دیاریكردن و پاڵاوتن و بەخشینی خەڵاتەكانمان دیاریكردووە. هەوڵیشمانداوە بەپێی توانا زانیاری و داتاو جیاكردنەوە و (چارت)ی جۆرا و جۆر بۆ بەرچاو روونی و زانیاری زیاتر بەدەستەوە بدەین. كە هەوڵمانداوە لەسەر ئاستی جیاواز جیاكردنەوەكان بە ئەنجام بگەیەنین.

لەگەڵ یاسا بنەڕەتییەكانی دامەزراوەی نۆبڵ، سەرەڕای چۆنێتی ئاگاداركردن و ئامادەبوونی پاڵێوراو لە كات و شوێنی دیاریكراودا بە مەبەستی وەرگرتنی خەڵاتەكە، لەگەڵ بڕ و جۆری خەڵاتەكان ئەگەریش نەمان توانیبێت بەپێی پێویست زانیاری و داتای تەواو ئامادە بكەین داوای لێبووردن لە خوێنەری ئازیز دەكەین، بەڵام ئەم پەرتووكە دەرفەت دەداتە خوێنەر داتا و زانیاری و جیاكاری و هەڵاواردن لەسەر ناوەڕۆكی پەرتووكەكە ئامادە بكات. ماوەتەوە بڵێین بە هەموو كەم و كورتییەكانییەوە هیوادارم توانیبێتم خزمەتێكی بچووكم بە كتێبخانە و خوێنەری كوردی كردبێت.

# پێشەکی

ئەوەی ئەمڕۆ بە ناوی خەڵاتی نۆبڵەوە ناسراوە یان دەناسرێت، لە راستیدا زیاتر خەڵاتی نۆبڵی ئاشتی و خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبە، بوارەکانیتری خەڵاتەکە کەمتر جێگەی بایەخی خەڵکن بەگشتی یان چاویان کەمتر لەسەرە. ئەم خەڵاتە لە ناوی دامەزرێنەرەکەیەوە وەرگیراوە کە زانا و داهێنەر و کیمیازانی بەناوبانگی سویدی ئەلفرێد بێرنارد نۆبڵە، و بۆ یەکەم جار لە ١٠ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٩٠١ لە ساڵ یادی کۆچی دوای نۆبڵدا دەستی بەبەخشینکرد، ئەمەش پاش پێنج ساڵ مشتومڕ و راگۆڕینەوە، پاش ئەوەی کە زانرا نۆبڵ لە ٢٧ تشرینی دووەمی ١٨٩٥ دا بۆ دواجار وەسیەتنامەیەکی نووسیوە کە تیایدا نووسیویەتی سەروەتەکەم بکرێتە سندووقێك و لە پڕۆژەی وەبەرهێناندا بەکاربهێنرێت، بەمەبەستی بەردەوام بوون و دابینکردنی سەرچاوەی دارایی بۆ خەڵاتەکە، و پاشان قازانجەکەی بکرێتە پێنج خەڵاتی یەکسان و ساڵانە لە بوارەکانی (فیزیا، کیمیا، نوژداری، وێژە، ئاشتی) ببەخشرێت، بەبێ لەبەرچاوگرتنی هیچ جۆرە رەگەز و رەنگی پێست و هاونیشتیمانێتی و ئینتمایەك، بەڵکە تاکە هۆکار بۆ بەخشینی خەڵاتەکە گرنگی و بایەخی ئەو کارەیە کە ئەو کەسە ئەنجامیداوە، کە توانیبێتی زۆرترین خزمەت بە بەشەرییەت بکات. حکوومەتی سوید ویستی فشاربخاتە سەر ئەو لیژنەیەی راسپێردرابوو بۆ جێبەجێکردنی وە سیەتەکەی نۆبڵ، بەگۆڕین و کورتکردنەوەی وەسیەتەکەی کە تەنها سویدییەکان بگرێتەوە، بەڵام لیژنەکە بڕیاریدا کە وەسیەتەکە پیت بە پیت جێبەجێ بکات بەبێ گۆڕان. پاشان و لە ساڵی ١٩٦٨ دا لە یادی مەرگی نۆبڵ و یادی ٣٠٠ ساڵەی دامەزراندنی بانکی ناوەندی سویددا بڕیاردرا خەڵاتێك لەلایەن ئەم بانکەوە بۆ خەڵاتەکان زیادبکرێت بەهەمان ئەو مەرجانەی کە نۆبڵ بۆ خەڵاتەکانی تری داناوە، لە ساڵی ١٩٦٩ دا یەکەم خەڵاتی نۆبڵ بۆ ئابووری بەخشرا، و ئەکادیمیای پاشایەتی سوید بۆ زانست کرایە لێپرساوی بەخشین و دیاریکردنی براوەی ئەم خەڵاتە، ئەویش دەیبەخشێت بە هەر کەسێك کە داهێنانێکی دیاری بەئەنجام گەیاندبێت لە بواری ئابووریدا. هەروەك لە وەسیەتنامەکەیدا دیاریکردبوو چەند دامەزراوەیەکی ئەکادیمی و زانستی کردە لێپرساوی دیاریکردنی براوەکانی



خەڵاتەکان، هەروەها جگە لە خەڵاتی ئابووری ئەکادیمیای پاشایەتی سوید بۆ زانست خەڵاتەکانی (فیزیا و کیمیا) دەبەخشێت، یان لێپرساوی دیاریکردنی کەسانێکە کە ئەم بوارانەی خەڵاتەکە دەیانگرێتەوە، پەیمانگای کارۆلینسکا لێپرساوی دیاریکردنی براوەی خەڵاتی نوژداریە، ئەکادیمیای سویدی لێپرساوی دیاریکردنی براوەی خەڵاتی وێژەیە، کۆمیتەی نەرویژی کە لە دەستەیەك پێکهاتووە و لەلایەن پەرلەمانی نەرویژەوە هەڵدەبژێردرێن ئەرکیان دیاریکردنی براوەی خەڵاتی نۆبڵی ئاشتییە. پاش ئەم زیادکردنە لەلایەن دامەزراوەی نۆبڵ و خێزانی نۆبڵەوە بڕیاردرا چیتر زیادکردن بۆ خەڵاتەکە ئەنجام نەدرێت، ئەم خەڵاتە پێکهاتووە لە دبلۆمێکی رێزلێنان کە بە هەردوو زمانی سویدی و نەرویژی ناوی براوەی خەڵاتەکە و ساڵی بەخشینی خەڵاتەکە و هۆکاری بەخشینی خەڵاتەکە و ناوی ئەو دامەزراوەی کە خەڵاتەکەی دیاریکردووە لەسەری دەنووسرێت. بەزۆری رازاوەتەوە بە گوڵ و باڵندە و زەغرەفە و بەکاری هونەری تر. ئیمڕۆ هەر دبلۆمێکی نۆبڵ کارێکی هونەری دەگمەنە، کە لەسەر پارچەیەك چەرم دروست دەکرێت، بە گشتی هەمان شێوازی نووسینی سەدەکانی ناوەڕاست بەکاردێت. مەدالیایەکی زێڕین، دیوی پێشەوەی مەدالیای بەخشینی خەڵاتی نۆبڵ نەخشاوە بە وێنەیەکی بەشی سەرەوەی لەشی ئەلفرێد نۆبڵ لەگەڵ ناوی ئەلفرێد نۆبڵ و ساڵانی لە دایك بوون و مردنی بە زمانی لاتینی، بەڵام دیوی پشتەوەی مەدالیاکان جیاوازە بۆ هەر خەڵاتێك بە شێوەیەك کە رەنگدانەوە و تەعبیرە لەو بوارەی خەڵاتەکە، کێشی (٢٠٠) گرامە، و تیرەکەی (٦٦) ملیمەترە، و لە ئاڵتونی عەیاری (٢٣) دروستکراوە . چەکێکی ماڵی، کە لە ساڵی ١٩٠١ دا بڕی (٧٨٢ ،١٥٠) کرۆنی سویدی بووە و لە ساڵی ٢٠٠١وە گەیشتۆتە ١٠,٠٠٠,٠٠٠ کرۆن کە نزیکەی یەك ملیۆن دۆلاری ئەمریکی دەکات بۆ هەر خەڵاتێك، بەڵام ئەگەر بۆ هەر خەڵاتێك لە کەسێك زیاتر دیاریکرا کە نابێت لە سێ کەس زیاتربن بە پێی یاسا بنەڕەتییەکانی دامەزراوەی نۆبڵ ئەوکاتە بۆ هەر کەسێك دبلۆم و مەدالیایەکی تایبەت دەبەخشرێت، بەڵام بڕی ماڵی خەڵاتەکە دابەش دەکرێت بە رێژەی جیاواز (١/٤،١/٣، ١/٢، ١) واتا بڕی ماڵییەکە دیاریکراوە بۆ هەر خەڵاتێك. ئاهەنگی بەخشینی خەڵاتەکان لە ١٠ی کانوونی یەکەمی هەموو ساڵێکدا کە رۆژی ساڵ یادی کۆچی دوایی نۆبڵە لە هەردوو شاری ستۆکهۆڵم و ئۆسلۆ بەڕێوە دەچێت لە یەك کاتدا، کە تەنها خەڵاتی نۆبڵی ئاشتی لە شاری ئۆسلۆ بەڕێوەدەچێت. بۆیە نۆبڵ وڵاتی نەرویژی هەڵبژاردووە بۆ بەخشینی ئەم خەڵاتە، چونکە ئەو کاتە و تا ساڵی ١٩٠٥ نەرویژ لە ژێر دەستی سویددابوو و شای سوید وەك شای ئەو وڵاتەش بوو وەك یەك وڵات بەحسابدەهاتن. خەڵاتی نۆبڵ ئامانج لێی خەڵاتی ئەو کەسانە بکات، کە خزمەت بە

مرۆڤایەتی دەکەن، ئامانجی سەرەکی هاندان و کۆمەککردنیانە بۆ توێژینەوەی زانستی. بەردەوام بوونی ئەو کەسانەی کە لە پێناو ئاشتی و پێکەوە ژیاندا هەوڵدەدەن بەبێ ئەوەی گرفتی ماڵیان بۆ دروستببێت.

ئەو هۆکارانەی کە وایکرد نۆبڵ ئەم خەڵاتە دابنێت و هەڵبژاردنی ئەو بوارانەی ئەم خەڵاتە دەیانگرێتەوە چییە؟ ئەوە پەیوەندی بە بیرکردنەوە و ئەو کاریگەریانەوە هەیە لەسەر ژیان و کەسایەتی خودی نۆبڵ، گەورەترین هۆکارێك کە وایکرد بیر لە دانانی ئەم خەڵاتە بکاتەوە هەستکردن بوو بە گوناهـ لە بەرامبەر بە مرۆڤایەتیدا، کاتێك بینی ئەو کارەی ئەو بەئەنجامی گەیاندووە بۆتە هۆی ماڵوێرانی و بەدبەختی بۆ مرۆڤ، لە جیاتی خزمەتکردن، ئەم بیرۆکەیەش کاتێك سەریهەڵدا کە هەواڵی مردنی خۆی لە یەکێك لە رۆژنامەکانی فەرەنسادا خوێندەوە، کە بە هەڵە لە جیاتی کەسێکی نزیکی ناوی ئەویان دانابوو. لەگەڵ ئەوەی رۆژنامەکان بە دروستکەری مەرگ ناوزەندیان دەکرد، چونکە نۆبڵ خاوەنی چەندین کۆمپانیای بەرهەمهێنانی تەقەمەنی بوو لە ئەوروپا و ئەمریکادا، ئەو بوارانەی کە دیاریکردبوون بۆ ئەم خەڵاتە هۆکەی لە پێش هەموویانەوە دەگەڕێتەوە بۆ کاریگەری ژنە شۆڕشگێڕی نەمساوی (بێرسا فۆن سوتنەر). کە ماوەیەك سکرتێرەی بوو و کارای بواری ئاشتی بوو، کە پاشتر پەیوەندییەکی رۆحانیان دروستکرد، ئەم خانمە توانی کاریگەری زۆر لەسەر نۆبڵ دابنێت، بە شێوەیەك رایگرتبوو لە نێوان ئەوەی کە واز لە کارگەکانی بهێنێت و دایانبخات یان بەردەوام بێت لەسەر کەڵەکەکردنی سەروەت و سامان، کە چەندین جار وەسیەتنامەی نووسیوە تا دواجار لە ساڵی ١٨٩٥ و ساڵێك بەر لە مردنی دواین وەسیەتنامەی نووسی، یەکسەر بێرسای لێئاگادار کردەوە بەوەی کە بەشێکی گرنگی بۆ ئاشتی تەرخانکردووە، هەر ئەم خانمەش توانی دواجار پاش مەرگی ئەو وەسیەتنامەکەی ئاشکرا بکات، کە لەلایەن راگنار سۆلمانی خزمەتکاری نۆبڵەوە پارێزرابوو، چونکە لە کاتی مردنیدا جگە لەو هیچ کەسێکی تری بە دەورەوە نەبوو. شایەنی باسە بێرسا لە ساڵی ١٩٠٥ دا خەڵاتی نۆبڵی ئاشتی وەرگرت، ئەمە سەبارەت بە ئاشتی. بوارەکانی فیزیا و کیمیاش هەر خۆی لەم بوارانەدا زانا و داهێنەربوو، بەهۆی داهێنانی لەم بوارەدا توانی ژیانی بە شێوەیەکی باش بگۆڕێت و سەرمایەیەکی گەورە کەڵەکە بکات، بۆ ئەدەبیش سەرەڕای نارەزایەتی توندی باوکی و لە سەرەتای لاوێتییەوە کەوتبووە ژێر کاریگەری شیعرەوە بە تایبەتی ئەدەبی ئینگلیزی، شیعری دەنووسی کە باوکی دەیویست ببێت بە ئەندازیار، نوژداری نۆبڵ لە کۆتایی تەمەنیدا لە تەندروستییەکی باش بەهرەمەند نەبوو هەمیشە بە شوێن چارەسەرییەوە بوو، سەرەڕای ناجێگیری باری دەروونی و هەستکردن



بە گوناهـ بەرامبەر بە مرۆڤایەتی بە تایبەتی مۆتەکەی دروستکەری مەرگ کە زۆر ئازاری دەدا. ئەمانە ئەو هۆکارانە بوون کە وایکرد نۆبڵ وەسیەتنامەکەی بنووسێت، بوارەکانی دیاری بکات. نۆبڵ لە تەمەنیدا ژنی نەهێناوە و منداڵی نەبوو، بۆیە لە پاڵ ئەم خەڵاتەدا بڕێك پارەی بۆ خوشکەزا و برازاکانیشی تەرخانکردووە لە وەسێتنامەکەیدا. ئەلفرێد نۆبڵ لە رۆژی ٢١ ی ئابی ساڵی ١٨٣٣ لە شاری ستۆکهۆڵمی پایتەختی سوید لە دایك بووە، سێهەم منداڵی خێزانەکەیەتی، لە ١٠ ی کانوونی یەکەمی ١٨٩٦دا کۆچی دوایکرد، لە شاری سان ڕیمۆی ئیتاڵیا بە تەنهایی، کە جگە لە خزمەتکارێك بەدەورییەوە کەسێك نەبوو. کە تا کاتێك کۆچی دوایکرد خاوەنی ٣٥٥ داهێنان بوو، بەڵام گەورەترینیان گۆڕینی نترۆگلیسرین بوو، ئەم ماددەیە کە خاوەنی توانایەکی بەهێزە لە کاتی تەقینەوەیدا هەروەها زۆر هەستیارە بە شێوەیەك هەڵسوکەوت کردن لەگەڵیدا ئاسان نییە، ئەم ماددەیە نزیکەی ١٠٠ ساڵ پێشتر دۆزرابووەوە تاکاتێك توانی گۆڕانکاری بەسەردا بهێنێت. باوکی ئەندازیاری پاکردنەوە و راکێشانی رێگەوبان بوو بۆ لابردنی بەربەستەکان سوودێکی زۆری لە تەقەمەنی دەبینی بەتەواوی هۆگری تەقەمەنی ببوو بە جۆرێك لە روسیا وەرشەیەکی دروستکردنی مینی دەریای دانا و خزمەتێکی زۆری سوپای روسیای کرد لە کاتی جەنگی قرمدا، قەیسەر مەدالیای خۆی پێبەخشی. لەم رێگەیەشەوە توانی ژیانی خێزانەکەی بگۆڕێت و منداڵەکانی خوێندنێکی تایبەت بخوێنن،کە مامۆستای تایبەتیان بۆ دابینکرا بوو، نۆبڵ خوێندکارێکی چەلەنگ بوو تەمەنی حەڤدە ساڵی تەواونەکردبوو، کە دەیتوانی بە پێنج زمان قسە بکات، کە سویدی و فەرەنسی و روسی و ئینگلیزی و ئەڵمانی بوون. لە کاتی خوێندنیدا سەردانی چەندین شوێنی کرد، لە پاریس خۆی لە کیمیادا دۆزییەوە وە پابەند بوو بە کارگەکەی پرۆفیسۆر " بیلوز" وە گرنگی پێدانەکانی هەمان گرنگی پێدانی باوکی بوو، کە تەقاندنەوەی تەقەمەنی بوو، بە گەڕانەوەی بۆ شاری ستۆکهۆڵم ئەلفرێد هەر لە بیرەوەری چێژی شلەی نیترۆگلیسریندا بوو، ئەو و باوکی کارگەیەکیان دامەزراند لە نزیك ستۆکهۆڵم بۆ دروستکردنی ئەم ماددەیە کە زۆر بەخێرای دەتەقێتەوە، هەستان بە دروستکردنی ١٤٠ کیلۆگرام لەم ماددەیە، بەڵام ساڵی ١٨٦٤ کارگەکە تەقییەوە، بووە هۆی کوشتنی برابچووکەکەی ئەلفرێد کە ناوی "ئیمل" بوو و چوار لە کارگەرە کیمیاگەرەکان، ئەم رووداوە برینێکی قوڵی لە ناخیدا بەجێهێشت، ئەلفرێد بیری کردەوە و بووە جێبایەخی یەکەمی چۆن ئەم ماددەیە کە بە خێرایی دەتەقێتەوە بگۆڕێت بۆ ماددەیەك کە کەمتر ترسناکبێت بۆ مرۆڤ، سەرەڕای توانا و خواستی مرۆڤ بۆ ئەو ماددەیە، ساڵی ١٨٦٦ سەرکەوتوبوو لە داهێنانی داینامیتدا. ئەویش بەتێکەڵکردنی

نترۆگلیسرین لەگەڵ چەندین ماددە کە پاشان لەگەڵ جۆرە لمێك تێکەڵێکرد و شێوە هەویرێکی لێپێکهات کە ئاسان دەتوانرا بگوێزرێتەوە و هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکرێت و هەستیارییەکەشی کەمتر کردبووەوە، ئەم کارەشی لە ئەڵمانیا ئەنجامدا. ئەم داهێنانە بەخێرای پێشوازی لێکرا و بە تایبەت ئەوکاتە کاتی لێکترازانی ئەوروپا و ناکۆکییەکانی ئەو سەرزەمینە بوو، بەخێرای توانای ئەم ماددەیە قۆسترایەوە بۆ بواری جەنگ و جۆرەها چەکی وێرانکەری لێدروستکرا.

چەك هۆکارێکە بەکاردێت لە کاتی شەڕدا کە دەشێت سوودی لێببینرێت بۆ مەبەستی بەرگری، یان هێرش، یان هەڕەشەکردن، بە شێوەیەکی زانستی دەکرێت هەر شتێك کە زیانبەخش بێت بە چەك دابنرێت، یان دەتوانرێت وەك چەك بەکاربهێنرێت و سوودی لێببینرێت. بەم شێوەیە لیستێکی فراوانی چەکمان دەکەوێتە بەردەست. لە سەدە سەرەتاییەکانەوە تائەمڕۆ چەك یەکێك لە گرنگترین هۆکارەکانی گۆڕین و دیاریکردنی ڕەوت و گۆڕانەکانی ناو مێژووی بەشەری بووە. لە سەدەکانی سەرەتای مێژووی شارستانییەتی یۆنان و رۆمەوە چەك تەنها کەلوپەلی بەهێزکردن و ئارایشتدان و خۆنواندن و هۆکارێکی دووەمی و پاڵپشتی مەهارەی فەردی بووە. واتا بەپلەی یەکەم توانا و رۆڵ و لێهاتوویی تاك رۆڵی باڵای هەبووە، نەك چەك. بۆیە سەردەمی داتاشینی ئەفسانە بووە لە توانا و باڵای ئەو کەسانە. پاشتر و لە سەدەکانی ناوەڕاستدا چەك پێشخرا خۆبەخۆ رۆڵ و لێهاتوویی شەخسی پاشەکشەی کرد. لە سەدەکانی رێنسانسدا دروستکردنی چەك لەگەڵ تەکنیك گرێی خوارد کە داهێنانی تۆپ و چەکە ئاگرینەکانی بەخۆیەوە بینی. لە ماوەی جەنگە ناوخۆییەکانی ئەمریکادا چەکە ئاگرینە سووکەکان و تۆپەکان هۆکارێکی گرنگ و یەکلاکەرەوە بوون کە لەگەڵیدا چەکی رەشاشی قورس دەرکەوت وەك هۆکارێکی نوێ. جەنگی جیهانی یەکەم سەرەتای سەدەی پیشەسازی چەك بوو کە وەك تەکنیکی نوێ دەرکەوت بە تایبەتی لە بواری گواستنەوەدا وەك فڕۆکە و ئۆتۆمۆبێلی جەنگی، بەڵام جەنگی جیهانی دووەم تەکانێکی نوێی بە بواری تەکنیك و جۆر و بڕی چەکی نوێدا، دیزاینی پێشکەوت و هاتە کایەوە لەو ماوەیەدا چەك و تەکنیکی جەنگی بە شێوەیەکی سەرسوڕهێنەر گەشەیان کرد، تا کار گەیشتە داهێنان و بەکارهێنانی چەك و بۆمبای ناوەکی، لە پاش کۆتایهاتنی ئەم جەنگە، بەشەرییەت رووبەڕووی جەنگێکی دژوار بووەوە کە بە جەنگی سارد ناودەبرا کە بە شێوەیەکی راستەوخۆ شەڕگەیەکی دیاریکراوی رووبەرووبوونەوەی سەربازی بوونی نەبوو. بووە هۆی پێشبڕکێیەکی سەیری خۆپڕچەك کردن لەلایەن هەردوو لای جەنگەکەوە بلۆکی رۆژهەڵات و بلۆکی رۆژئاوا، کە دامەزراوەی



تایبەتمەندیان لەم بوارەدا دروستکرد بۆ پێشخستنی چەك و تەکنیکی سەربازی و توانیان چەکی هایدرۆجینی و گاما و لەیزەری دروستبکەن، پاش ئەم جەنگە جەنگەکانی کەنداو و دژەتیرۆر بازنەیەکی تری خۆپڕچەك کردن و گەشەی ئەم بوارە بوو، ئەوەبوو ئەمریکا لە عێراقدا بۆمبای نۆ تەنی تاقیکردەوە. بە کورتی مرۆڤ ئەوەی لە توانایدا بووە کاریکردووە بۆ کەشفکردنی سروشت و دەوروبەری هەمیشە زانست و داهێنانی نوێی دۆزیوەتەوە و پەرەی پێداوە، بەقەد ئەوەی توانیویەتی زانست و داهێنان بۆ خزمەتی خۆی بەکاربهێنێت، ئەوەندەش گۆڕاون بۆ جەنگ و پێکادان و رێگەیەك نەماوەتەوە بۆ گفتوگۆ و لێك تێگەیشتن. لێرەدا ئەوەی دەبێت بە پرسیار ئەوەیە ئایا گوناهی زانستە چارەنووسی مرۆڤی بەم سەرەنجامە گەیاندووە؟ مرۆڤ خۆی دۆزەرەوە و گەشەپێدەری زانستە ئەگەرچی زۆربەی کات بە شێوەیەکی مەوزوعی بوونیان هەیە، بەڵام مرۆڤ دەیاندۆزێتەوە و گۆڕنکاریان بەسەردا دێنێت، هەر خۆشی بەکاریی دەهێنێت یاخود توزیفی دەکات. زانست و بابەتە زانستییەکان رۆڵێکی دولایەنەدەگێڕن یان راستترە بڵێین بوونێکی بێلایەنانەیان هەیە بە گشتی، کەواتە گوناهی یەکەم دەکەوێتە ئەستۆی مرۆڤ، چونکە ئەو وەزیفەی بۆ دیاریدەکات، بۆ نموونە بۆمبایەکی ناوەکی دەتوانرێت بکرێتە سەرچاوەی دابینکردنی وزەی کارەبا بۆ وڵاتێك، لە هەمانکاتدا لە توانایدا هەیە ببێتە سەرچاوەی کاولکردنی وڵاتێکیش. چەك وەسیلەی بەڕێوەبردن و گەرمکردنی جەنگەکانە، بەڵام سەبەبی جەنگەکان جیاوازن و هۆکار و پاڵنەری تریان هەیە، کە ریشەیەکی مێژووییان هەیە و بەگشتی کۆنن، بەڵام هەمیشە چەکەکان تازە و مۆدێرنن. بۆیە جەنگ دیاردەیەکی کۆمەڵایەتییە لە سەردەمێکی دیاریکراوی مێژوویدا روودەدات و لە سەردەمێکی تری مێژوویدا کۆتایی دێت، وێنە سەرەتاییەکانی سەر بەرد و دیوارەکانی ئەشکەوتەکان کە مرۆڤ لەسەری هەڵیکەندوون و کێشاونی پڕن لە وێنەی کوشتن و لە نواندنی هێز و هۆکارەکانی جەنگ وەك رم و تیر و کەوان و چەکوشی بەردین و چەقۆ و شتی لەم بابەتانە، کە هۆکاری دەست بەسەرا گرتن و رام کردنی بەرامبەر و دەوروبەرە، و زۆربەی هەرە زۆری ئەو نووسراوانەی لەسەر ستونە بەردین و تاشە قوڕین و پێستە بەجێماوە مێژووییەکان ماونەتەوە و دۆزراونەتەوە باسی جەنگ و سەرکەوتن و سڕینەوە و ئەو جەنگانە دەکەن کە شارستانییەتییەك یان گروپ و لایەنێك بەرانبەر بە یەکێکیتر بەرپای کردووە. ئەمەش کاتێك روویداوە کە ویستویەتی خۆراك و ئاژەڵ و هێزی کار و سەروەت سامان و هۆکارەکانی ژیان و شارستانی و لێزانی بەرانبەر ببات بۆ خۆی سوودی لێوەربگرێت، لێرەوە تێدەگەین لەوەتەی موڵکایەتی تایبەتی پەیدابووە جەنگ هۆکارێك بووە بۆ گەشەپێدان و فراوانکردنی ئەو موڵکایەتییە، واتا جەنگ بەقەدەر پەیدابوونی موڵکایەتی

کۆنە، بە درێژایی مێژوو ئەم هۆکارە بنەڕەتییە ئارایشتی تری خۆی کردووە گۆڕانێکی شکڵی نەك جەوهەری بەسەردا هاتووە بە شێوەیەك لە روخساردا مرۆڤ واهەست دەکات هۆکاری تر پەیدابووە بۆ هەڵایسانی جەنگەکان، وەك جەنگە سنوورییەکان، جەنگە ئایینی و ئایدۆلۆژییەکان و جەنگی دژەتیرۆر هتد........، کە ئەمانە بەرەنجامی جەنگە یەکەمیەکانن، یان ئارایشتی نوێی روخسارە کۆنەکەن. هۆکار و وەسیلەی پێشکەوت و بەشداری ئەم ناکۆکی و رام کردن و سڕینەوەیە دەکەن، بۆیە هەر دۆزینەوە و زانستێکی نوێ یەکەم جار دەخرێتە خزمەتی سەربازییەوە، بەرلەوەی سوودی لێببینرێت لە لایەنەکانی تری ژیاندا. بۆ نموونە تۆڕی جاڵجاڵۆکەیی (ئینتەرنێت) بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ بەرنامەیەکی تایبەتی خزمەتگوزاری وەزارەتی بەرگری ئەمریکابوو بەرلەوەی جیهان پێی ئاشنابێت. بۆیە تێدەگەین ئەم نزعەیە تائێستا گەشە دەکات لای مرۆڤایەتی ئەم سەردەمە. جەنگ و هۆکارەکانی گەرمکردنی سیمایەکی دیار و بەرچاوی سەردەمی مۆدێرنەبووە بە شێوەیەك جیاواز لە پێشتر بە تەکنیك و چەندایەتی و چۆنایەتی زۆر پێشکەوتووەوە، کاتێك مۆدێرنە بانگەشەی بۆ دنیای مەدەنی دەکرد و جاڕی ئازادی و یەکسانی مرۆڤایەتیدا، ئەم بانگ هەڵدانەی لە بەرامبەر دنیا و کۆمەڵگای بەربەریدا بوو، کاتێکیش سەرمایەداری ویستی ئەم نامەیە بگەیەنێتە مرۆڤی سەردەم خۆی لە بەرامبەر بە دەرەبەگایەتیدا ئارایشدا، مۆدێرنە دەستی مرۆڤی لەسەر ئاستی تاك لە دەستی زۆرێك لە سیماو کۆتەکانی ئەو دنیایە کردەوە وەك مەزهەب و دین وەك خێڵ و قەوم و قەبیلە، بەڵکە ئەمانەی لە ئاستێکی گەورەتردا رێکخست و بە شێوەیەك کردنییە کۆنفیدراڵییەت و بە ناوی دەوڵەتەوە ناوینان کە لە یەکێتی خێلەکان پێکهاتبوو، تا رادەیەك ئینسانەکانی سەرپشك کرد لە ئینتمایاندا بۆ ئەم کۆنفیدراڵیانە واتا کۆنفیدراڵییەتی قەبیلەکان و خێڵەکان و بووە کاری تایبەتی ئەم تاکانە، بەڵام دەوڵە خۆی دەستبەرداریان نەبوو و بووە سەرمایەیەکی بەهێز بۆ رێخستن و لە قاڵبدانی مرۆڤەکان لەسەر ئاستی گشتی و لەپەیوەندییەکی پتەودامایەوە لەگەڵیاندا، چونکە ئەسڵەن لە یەکێتی و یەکگرتنی ئەم هۆکارانەوە بەوجود هاتبوو.  یەکێك لە سیما دیارەکانی مۆدێرنێتە و دنیای مەدەنی جەنگ بوو. جەنگ واتا هەڵبژاردنی ژیان و مردن ئەویش بەگشتی ئیختیاری نییە بەڵکە ناچارییە کاتێك جەنگ دەقەومێت. مۆدێرنە ئاڕاستەی مرۆڤی گۆڕی لە ئاڕاستەیەکی دەستەییەوە بۆ تاك ئاڕاستە و لە رهەندە مێژوویەکانی دایماڵی تا ئەو شوێنەی بۆیکرا، مرۆڤی سەردەم مرۆڤی بەرژەوەندخوازی تاك پەرستانە و خۆپەرستانەیە، هەر ئەم هۆکارەش وایکرد دەوڵەتە گەشەسەندووەکان بخاتەسەر سکەیەکی جێگیرتر، هەروەك دەبینین ئەمجارەیان چەندین



ئمپراتۆریەتی رۆم پەیدابوون و بوونە ماشێنێکی زەبەلاح و سەروەت و سامانی وڵاتانی تریان هەڵلوشی کێبڕکێی نێوان دەوڵەتانی کۆلۆنیالیزم لەسەر ماشینەوەی سەروەت و سامانی ئەو وڵاتانەی کە دەستیانی پێدەگەیشت بەشێکە لەو نزعەیەی کە مرۆڤی سەرەتایی دووبەردی خستەسەریەك و وتی ئەمە هی منە. تادەگات بە جەنگەکانی ئەم دواییە کە ئەفەندییە خاوەن کەماڵەکانی رابەرانی دنیای مەدەنی و ئازادی و دیموکراسی و نێو کۆشکە خەزەفییەکانی دنیای ئەمڕۆ بڕیاری برسی کردنی ملیۆنان کەسیاندا لە چوارچێوەیەکدا کە باپیرانی ئەوان کێشابوویان لە جەنگەکانی بەشکردنی نێوان خۆیاندا بە ناوی عێراقەوە. پاشان ملیۆنان تەن لە بۆمباو باروتیان بەسەریاندا باراند و یەك ملیۆن کەس تائێستا قوربانی ئەم جەنگەیە بەناوی جەنگی رزگارییەوە. قوربانییەکانی جەنگ هەمیشە رێژەیەکی فراوانی خەڵکی مەدەنی و بێدیفاع بووە، جگەلەوەی سەروەت و سامانی وڵاتی هەڵلوشیوە بویشەتە هۆی برسێتی و لەبەین چوونی خزمەتگوزارییە سەرەتایی و پێویستەکانی ژیانی رۆژانەش، جەنگ جیاوازی نەکردووە لە نێوان سەرباز و مەدەنیدا هەموو شوێنێك شەڕگە و شوێنی یەکلاکردنەوەی حساب بووە، شێرکۆ بێکەس دەڵێت  " کە دارستان ئاگری گرت داری بێلایەن کامەیە تا نەسوتێ ".بۆیە مرۆڤ ئەگەر ڕێگایەك لەبەردەمیدا مابێت ئەوەیە دنیایەکی ئارەزوومەندانە کە رەنگدانەوەی ناخی بێت دابمەزرێنێت، کە تیایدا توانا و هێزی خولقێنەری مرۆڤ بە قازانجی ژیاندۆستی بێت نەك ئاگرێکی سوتێنەر، لەم دنیایەدا مرۆڤ لە سەرجەم ئەو قەید و بەندانە رزگاربێت، کە دور لە ئارەزوو و ئیرادەی ئەو ژیانی کردۆتە دۆزەخ.  نیچە پێیوایە "ئازادی ئەوەیە کە مرۆڤ شەرمەزاری خۆی نەبێت"، دەڵێت "ئەرکی مرۆڤی سەردەم هەڵسەنگاندنەوە و بژارکردنی بەهاکانە"، ئەویش بەخۆ قوتارکردن لەو ئایکۆنانەی  مرۆڤ  بەدرێژایی مێژوو لە بوارەکانی، ئاین، هونەر، سیاسەت، کۆمەڵایەتی، هتد....  دروستی کردون، واتا مرۆڤ مافی هەڵبژاردنی هەبێت بەبێ ئەگەر و لەمپەر کەرامەت و ژیانی پارێزراوبێت بەبێ بەرامبەر، تا بە ئاشتی بۆ هەتایە بژی. ئاشتی ئایکۆنێکە لەبەرامبەر جەنگدا، ئەگەرچی تەمەنی جەنگەکان کورتترە، بەڵام ئەوەی بەشەرییەت لە ماف و ئازادی و نان ژیان و شارستانییەت و سەروەری بەدەستی دەهێنێت بە هەوڵ و تێکۆشان و ماندوبوون، جەنگ بە ماوەیەکی ئەوەندەکەم کە بەراورد ناکرێت بە کاتی پەیداکردن و بە دەستهێنانی  لە توانایدا هەیە لێیبسەنێتەوە، بۆیە هەمیشە سەرچاوەی نەهامەتی و مەحرومییەت بووە بۆ ئینسان، مرۆڤ بە سروشتی خۆی ئاشتیخوازە لەبەر ئەوەی یەکەوڕاست پەیوەستە بەژیان و چێژ بردن لە ژیانەوە، بەڵام کاتێك ئاشتی دەکەوێت بەر مەترسی واتا ژیان لە مەترسیدایە بۆیە بەرگری لێدەکات، هەمیشە تەمەنی

ئاشتی درێژتر و پڕ بەرهەم و خزمەت بووە بە مرۆڤ، زانست و زانیاریش هەر لە کاتی ئاشتیدا توانیویانە خزمەت بە مرۆڤ بکەن. تەنانەت دەبینین لە کاتی جەنگەکانی جیهانی یەکەم و دووەمدا نەتوانراوە خەڵاتەکانی نۆبڵ ببەخشرێت، رەنگە نۆبڵ ئاگاییەکی وەهای هەبووبێت یان گەیشتبێت بە ئەنجامێك کە ئاکامی جەنگەکان هەمیشە ئەتککردن و ئیستغلالکردنی زانست و بەهاکانی مرۆڤایەتییە، بۆیە هەستی بەگوناهێکی زۆرکرد کاتێك بینی ئەوەی ئەو لە زانستدا بەدەستیهێناوە پێچەوانەی ناخ و خواستی ئەو دەتوانرێت خراپ بەکاربهێنرێت لەسەر مرۆڤایەتی. ئەو بۆی دەرکەوت کە دوو فیرقەی سەربازی زۆر بەئاسانی دەتوانن یەکتری لەناوبەرن بە هۆی ئەو چەك و تەکنیکەی کە لەبەردەستیاندایە، ئەمەش واتا چارەنووسی مرۆڤایەتی لەخەتەردایە. ئەو وتی کە خراپە شاراوەکانی ناخی مرۆڤ بۆتە هۆی ئەوەی کە دایناميت وەك هۆکارێکی وێرانکەر و هۆکاری جەنگ بەکاربهێنرێت. بۆ بەرگرتن بەمەش ئەو وایبینی کە مرۆڤە زانا و ئاشیخوازەکان هانبدات بۆ خزمەتکردن نەك بەپێچەوانەوە ئەویشی لە رێگەی خەڵاتی نۆبڵەوە جێبەجێکرد و تائێستاش بەردەوامە. بۆیە ئامانجی ئەم خەڵاتە کۆمەککردن و دەستگیرۆیی کردن و هاندانی کەسانێکە کە لە توانایاندا هەیە خزمەت بە مرۆڤایەتی بکەن، راستە ئەوەی ئەوان بە دەستی دەهێنن لە ئاکامی هەوڵ و ماندوبوونە ئەوان دەبنە خاوەنی، بەڵام دواجار دەبێتە موڵکی مرۆڤایەتی، داهێنانەکانی نۆبڵیش بەشێکە لەو سەروەتە، خەڵاتی نۆبڵیش هاندەر و پشتیوانیەکی ئەستوری ئەو سەروەت و سەروەریانەیە...

**نیا کامیل**

**سلێمانی٢٠٠٨**

# ئەلفرێد بێرنارد نۆبڵ Alfred Bernhard Nobel




درەختی خێزانی نۆبڵ

ناوی زانا ئەلفرێد نۆبڵ بە یەکێك لە ناودارترین ناوەکانی جیهان دادەنرێت، هەروەك خەڵاتێك بەناوییەوە هەیە، کە یەکێك لە پێشکەوتووترین خەڵاتەکانی دنیایە و زۆرترین ناوبانگی هەیە، گەورەترین نرخی هەیە، جا نرخی ماددی بێت یان نرخی ئەدەبی و مەعریفی. ئەلفرێد بێرنارد نۆبڵ لە رۆژی ٢١ ی ئابی ساڵی ١٨٣٣ لە شاری ستۆکهۆڵم پایتەختی سوید لە دایك بووە، باوکی "ئەمانوئێل نۆبڵ" ئەندازیاری مەدەنی بووە، تایبەتمەندی رێگاوبان بووە، داهێنەر بووە لە بوارەکەی خۆیدا، بە تایبەت لەو رێگا و بانانەی کە بەرد وێرانی کردبوون. باوکی ئیفلاسی کرد لە هەمان ساڵدا کە کورەکەی " ئەلفرێد " لە دایك بوو، ئاگری فەقیری هەرەشەی لە خێزانەکەی کرد، پاڵی بەباوکییەوە نا کە بە تەنها کۆچ بکات بۆ فنلەندا ساڵی ١٨٣٧ بۆ گەران لە شوێنی هەلێکی ژیانی باشتردا، پاشان بە خێرایی چوو بۆ "سات پەترسبەرگ" ی پایتەختی روسیای قەیسەری کە لە رووی جوگرافییەوە نزیکە لە ستۆکهۆڵمەوە. لە شاری پەترسبەرگ سازینگەیەکی میکانیکی، دامەزراند،کە چەند گرێبەستێکی لەگەڵ سوپای روسیادا بەست و باری بژێوی باشتر بوو. ناردی بە شوێن خێزانەکەیدا ساڵی ١٨٤٢ تا لە پەترسبەرگ یەك بگرنەوە. سەرکەوتنی بنەرەتی ئەمانوئێل لە داهێنانی مینی دەریایدابوو، کە لە جەنگدا بەکاردەهات، کە سوپای روسی بە دانانی تۆرێك لەم مینە لە ئاوی دەریای بەلتیك و لە دەوری شاری پەترسبەرگ شارەکەی پاراست لە دەریاوە لە کاتی جەنگی "قرم" کە لە ساڵی "١٨٥٣-١٨٥٦" لە نێوان روسیا لە لایەك و فەرەنسا و بەریتانیا لە لایەکیتر بەرپابوو. کە کەشتییە دەریایەکانی بەریتانیا نەیانتوانی ئەم تۆرە مینییە ببەزێنن یان لە شارەکە نزیك بکەونەوە،



وەك رێزێك بۆ داهێنانەکەی ئەمانوئێل مەدالیای ئاڵتونی ئیمپراتۆری لەلایەن قەیسەری روسیاوە پێبەخشرا. پاش سەرکەوتنی ئەمانوئێل لە ژیانی کردەیدا لە شاری پەترسبەرگ و پێکەوەنانی سامانێکی گەورە لە داهێنانی مینی دەریایدا، بۆیە ویستی قەرەبووی هەرچوار منداڵەکەی بکاتەوە (رۆبەرت، لۆدڤیك، ئەلفرێد، ئیمل) لەو ساڵە ناخۆشانەی پێشوو کە ئاستێکی بەرزی خوێندنی بۆ دابینکردن، مامۆستای بۆ دابینکردن تا هەستێت بە فێرکردنی زانستی سروشتی و کیمیا و فیزیا و زمانەکان و وێژە. ئەلفرێد گەیشتە ئاستێکی زۆر بەرز هێشتا تەمەنی حەڤدە ساڵی تەواونەکردبوو کە دەیتوانی بە پێنج زمان قسە بکات، کە سویدی و فەرەنسی و روسی و ئینگلیزی و ئەڵمانی بوون، بەڵام بایەخ پێدانی ئەلفرێد رووەو وێژە رۆیشت، بە تایبەت وێژەی ئینگلیزی، هۆنراوەی دانا، کە باوکی زۆر بایەخ پێدانەکەی کورەکەی بەوێژە و هەوڵدان بۆ دانانی هۆنراوە بەدڵ نەبوو، دەیویست قاڵبێت لە پرۆژە ئەندازیارییە شارستانییەکانیدا، ناردی بۆ دەرەوە بۆ زنجیرەیەك گەشت بۆ چەند وڵاتێك تا فێربوون لە کیمیادا بەردەوام بێت. ئەلفرێد سەردانی سوید و ئەڵمانیا و فەرەنسا و ئەمریکای کرد.

لە پاریس ئەلفرێد خۆی لە کیمیادا دۆزییەوە و پابەند بوو بە کارگەکەی پرۆفیسۆر "بیلوز" وە گرنگی پێدانەکانی هەمان گرنگی پێدانی باوکی بوو، کە تەقاندنەوەی دینامیت بوو، هاورێییەتی دوو زانای کیمیاوی دەکرد، کە هەمان گرنگی پێدانیان هەبوو، کە " ئاسانۆی سوپر سرو" ی ئیتاڵی کە شلەی نیترۆگلیسرین کە زۆر بەزووی دەتەقییەوە ئامادەکرد بوو.

لە ئەمریکا چاوی کەوت بە داهێنەری سویدی کە رەگەزنامەی ئەمریکی وەرگرتبوو، "جوزا ئاریکسۆن" کە ئەم چاوپێکەوتنە پاشتر شوێن پێی جێهێشت لە باوەرپێکردنی ئەلفرێد و دنیا بینی ئەو بە کارەکەی باوکی لە بواری سروشت و بە کارهێنانی کیمیادا، لە ماوەی ساڵی ١٨٦٢ لەگەڵ کۆتایی جەنگی قرمدا رێکەوتنەکانی سوپای روسیا وەستا، کە بووە هۆی خراپ بوونی باری دارای ئەمانوئێل نۆبڵ، و بریاری گەرانەوەی بۆ سویددا لە شاری ستۆکهۆڵم دانیشت خۆی و هەردوو کورەکەی ئیمل و ئەلفرێد، لە و کاتەدا رۆبەرت و لۆدڤیگ لە پەترسبەرگ مانەوە. بە گەرانەوەی بۆ شاری ستۆکهۆڵم ئەلفرێد هەر بیرەوەری چێژی شلەی نیترۆگلیسرینی هەبوو، ئەو و باوکی کارگەیەکیان دامەزراند لە نزیك ستۆکهۆڵم بۆ دروستکردنی ئەم ماددەیە کە زۆر بەخێرای دەتەقێتەوە، هەستان بە دروستکردنی ١٤٠ کیۆگرام لەم ماددەیە، بەڵام ساڵی ١٨٦٤ کارگەکە تەقییەوە، بووە هۆی کوشتنی برابچووکەکەی ئەلفرێد کە ناوی "ئیمل" بوو و چوار لە کارگەرە کیمیاگەرەکان، ئەم رووداوە برینێکی قوڵی لە ناخیدا بەجێهێشت، ئەلفرێد بیری کردەوە و بووە

جێبایەخی یەکەمی چۆن ئەم ماددەیە کە بە خێرای دەتەقێتەوە بگۆڕێت بۆ ماددەیەك کە کەمتر ترسناك بێت بۆ مرۆڤ، سەرەڕای توانا و خواستی مرۆڤ بۆ ئەو ماددەیە، ساڵی ١٨٦٦ سەرکەوتوبوو لە داهێنانی دایناميتدا، داهێنانەکەی بەکارهێنانێکی فراوانی لە سەرجەم دنیادا بەخۆوەبینی. ئەلفرێد هەستا بە بنیاتنانی دەیان کارگە لە بیست وڵاتتدا، لەمەوە سامانێکی گەورەی پێکەوە نا کە بووە یەکێك لە دەوڵەمەنترین دەوڵەمەندەکانی جیهان. ڕۆژنامەکان هەڵمەتێکی هێرشیان کردە سەر ئەلفرێد لە ئەوروپادا، و هەندێك لە ڕۆژنامەکان نازناوی دروستکەری مەرگیان لێنابوو، لەبەرئەوەی داهێنانەکانی بوو هۆی ئەوەی بە شێوەیەکی بەرفراوان لە جەنگەکاندا بەکاربێت. ئەم هەڵمەتە وێنەیەکی دەروونی پێچەوانەی لای ئەلفرێد دروستکرد کە هەمیشە خەونی بە کۆتایی جەنگەکانەوە دەبینی، ئەو وای دەبینی کە داینامیت بە خۆشگوزەرانی لای مرۆڤ دەکەوێتەوە، لە چوارچێوەی بەکارهێنانەکانی دایناميتدا بۆ هەڵکەندنی کانەکان و دەرهێنانی خێر و بەرهەمەکانی سروشت لە ناخی زەویدا و هەڵکەندنی تونێل و ڕێگە و بان بۆ ئاسانکاری بازرگانی و پەیوەندی لە نێوان مرۆڤەکاندا. لە چوارچێوەی هەڵمەتێکیدا وتی کە خراپە شاراوەکانی ناخی مرۆڤ بۆتە هۆی ئەوەی کە داینامیت وەك هۆکارێکی وێرانکەر و هۆکاری جەنگ بەکاربهێنرێت، ئەم ئاڕاستەیە بەردەوام بوو پێی لەسەر ئەوە داگرت کە ئەلفرێد نۆبڵ دڵگران بووە دڵگرانیەکی زۆر، لە کۆتایی ژیانیدا بڕیاریدا هەندێك لە سامانەکەی ببەخشرێتە هەرکەسێك کە یارمەتی خۆشگوزەرانی مرۆڤ دەدات.

## وەسیەتنامەکەیی و خەڵاتەکە

ئەلفرێد نۆبڵ لە ١٠ ی کانوونی یەکەمی ١٨٩٦دا کۆچی دوایکرد، لە شاری سان ریمۆی ئیتاڵیا بە تەنهایی، کە جگە لە خزمەتکارێك بەدەوریيەوە کەسێك نەبوو، ژنی نەهێنابوو، پاش خۆی سامانێکی فراوانی بە جێهێشت کە نزیکەی ٣٠ ملیۆن کرۆنی سویدی بوو، کە نزیکەی ١٥٠ ملیۆن دۆلاربوو، نۆبڵ سەرجەم سامانەکەی تەرخان نەکردبوو، بۆ خەڵاتەکە هەروەك ئەوەی باوە . لە وەسیەتەکەیدا بڕێکی گونجاو بۆ دۆست و نزیکەکانی تەرخانکراوە، بەڵام لایەنی گەورە لە سامانەکەی داناوە بۆ وەبەرهێنانی لە پڕۆژەی قازاجیدا وەبەرهێناندا، کە لە خێرەکەی پێنج خەڵات ساڵانە بۆ پێنج کەس کە زۆرترین سوود بە مرۆڤایەتی بگەیەنن ببەخشرێت، هەرکەسێك کە توێژینەوەیەکی دیاری ئەنجامدابێت، یان هەرکەسێك داهێنانێکی



نوێی کردبێت یان هەر کەسێك کە خزمەتێکی کۆمەڵایەتی بەخشندەی ئەنجامدابێت، لە پێنج بواری دیاریکراودا بواری فیزیا و کیمیا و پزیشکی و فیسیۆلۆژی و ئەدەب و ئاشتی جیهانی.

نۆبڵ وەسیەتی کردبوو، کە ئەکادیمیای پاشایەتی سوید بۆ زانست هەستێت بە هەڵبژاردنی براوە لە بواری کیمیا و فیزیادا، پەیمانگای کارولینسکا لە ستۆکهۆڵم هەستێت بە هەڵبژاردنی براوەی بواری پزیشکی و فیسیۆلۆژیا، ئەکادیمیای سوید هەستێت بە هەڵبژاردنی براوە لە بواری وێژە، پەڕلەمانی نەرویژی هەستێت بە هەڵبژاردنی پێنج کەس کە براوەی ئاشتی جیهانی دەستنیشان بکات. نۆبڵ وەسیەتی کردبوو، کە دەخوازێت هەڵبژاردنەکان بۆ خەڵاتەکان پاك و بێخەوش بێت، یان خەڵاتەکە بدرێت بەهەر یەکێك کە زۆرترین هەوڵیدابێت بە چاوپۆشین لە رەگەزنامەکەی، جاسویدی بێت یان نە.

جیاوازی و وتووێژێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و یاسای ڕوویدا لەسەر لێکدانەوەی دەقی وەسیەتەکەی ئەلفرێد نۆبڵ، کە ماوەی پێنج ساڵ بەردەوام بوو، حکوومەتی سوید ویستی فشاربخاتە سەر ئەو لیژنەیەی ڕاسپێردرابوو بۆ جێبەجێکردنی وەسیەتەکەی نۆبڵ، بەگۆڕین و کورتکردنەوەی وەسیەتەکەی کە تەنها سویدییەکان بگرێتەوە، بەڵام لیژنەکە بڕیاریدا کە وەسێتەکە پیت بە پیت جێبەجێ بکات بەبێ گۆڕان. پێشکەشکردنی خەڵاتی نۆبڵ یەکەم جار لە ساڵی ١٩٠١ لە ساڵ یادی کۆچی دوای نۆبڵدا لە ١٠ی کانوونی یەکەمدا دەستی پێکرد، بەپێی ئەو وەسیەتەی کە جێیهێشت بوو سەبارەت بە خەڵاتەکان، ناوی براوەکان هەموو ساڵێك لە مانگی تشرینی یەکەمدا رادەگەیەنرێت، لەلایەن لیژنەی دیاریکراوەوە بۆ دەستنیشانکردنی براوەکان، ئاهەنگی پێدانی خەڵاتەکان لە هۆڵی ئاهەنگە مۆسیقییەکانی ستۆکهۆڵم ڕێکدەخرێت، ئەو هۆڵە بۆ هەزار وسێسەد میوان ڕێخراوە، میوانەکان بریتین لە خێزانی براوەکانی خەڵاتەکان و ئەندامانی خێزانی پاشایەتی سویدی و سیاسییەکان و دبلۆماتەکان و نوێنەرانی حکوومەتەکان لە سوید و ئەندامانی پەڕلەمان. دابەشکردنەکە لە سوید ئەنجامدەدرێت، شای سوید خۆی چاودێرە لەسەر پێدانی خەڵاتەکان و بەخشینی بە خاوەنەکانیان، کە خەڵاتەکانی کیمیا و فیزیا و وێژە و پزیشکی و ئابوورین، بەڵام خەڵاتی ئاشتی لە هۆڵی ئەنجوومەنی شاری ئۆسلۆ لە نەرویژ دەبەخشرێت بە پێی وەسیەتەکەی نۆبڵ

خەڵاتی نۆبڵ بریتییە لە بڕێکی ماددی زۆر کە زیاتر لە سی هەزار دۆلار بوو لە ساڵانی سەرەتای خەڵاتەکەدا، گەیشتە حەوسەد هەزار دۆلار لە سەرەتای نەوەدەکانی سەدەی رابردوودا، لە ئێستادا بڕی خەڵاتە ماددییەکە نزیکەی یەك ملیۆن دۆلارە کە

دەكاتە دە مليۆن كرۆنی سويدی، جا كەسێك وەری بگرێت يان زياتر، ئەم خەلاّتە دەبەخشرێت لە رێگەی چەكێكەوە كە بڕی ماڵی خەلاّتەكەيە، مەداليايەكی ئاڵتونی كە رەسمی نۆبڵی لەسەر نەخشاوە، بڕوانامەيەكی رێزلێنانيش دەبەخشرێت بە كەسی براوە. پاشان و لە ساڵی ١٩٦٩ دا خەلاّتی شەشەمی بۆ زياد بوو، كە تايبەت بوو بە زانستی ئابووری، كە بانكی ناوەندی سويد دەی بەخشێت بە بۆنەی ٣٠٠ ساڵەی دامەزراندنييەوە، بەلاّم خانەوادەی نۆبڵ دانيان بە ئەم زيادكردنەدا نەنا، چونكە نۆبڵ ناوی نەهێنا بوو لەو بوارانەی كە خەلاّتەكە دەيگرێتەوە، لە هەمان ساڵدا بڕياردرا كە نوێكاری نەكرێت لە خەلاّتەكەدا.



### وێژگەكانی ژيانی ئەلفرێد نۆبڵ Alfred Nobel Timeline

١٨٣٣- ئەلفرێد بێرنارد نۆبڵ (Alfred Bernhard Nobel) لە ستۆكهۆڵم (Stockholm) لە سويد (Sweden)لە دايك بووە، ئەمانوئێل نۆبڵی باوكی ئيفلاسيكرد.

١٨٣٧ -ئەمانوئێل نۆبڵ (Immanuel Nobel) چوو بۆ فنلەندا (Finland) و پاشان بۆ سات پەترسبەرگ، لە روسيا (Russia) سازنگەيەكی ميكانيكی دامەزراند، خێزانەكەی لە سويد بەجێهێشت.

١٨٤٢- خێزانەكەی نۆبڵ يەكيانگرتەوە لە سات پەترسبەرگ (St. Petersburg).

١٨٥٠-١٨٥٢ – ئەلفرێد نۆبڵ چوو بۆ پاريس (Paris)، بۆ ماوەی ساڵێك لە تاقيگەی " تی. جۆلز پيلۆز " T.Jules Pelouze) (كاری كرد. چوو بۆ ئيتاڵيا (Italy) و ئەڵمانيا (Germany) و ئەمريكا (America).

١٨٥٣-١٨٥٦- رووداني جەنگی قرم (Crimean) . كۆمپانيای نۆبڵ دەركەوت، بەلاّم پاشان ئيفلاسی كرد كاتێك جەنگ كۆتايهات بە هۆی نەمانی داواكاری لەسەر مينی سەربازی روسی.

١٨٦٠- ئەلفرێد نۆبڵ دەستيكرد بە تاقيكردنەوە لە سەر نترۆگليسرين (Nitroglycerine).

١٨٦٣ - يەكەم داهێنانی لە نترۆگليسريندا (تەقاندنەوەی نەوت)ی ئەنجامدا، وەك ماددەيەكی تەقەمەنی پشەسازی، گەشەيپێدا و بە ناوی ئەوەوە وەك داهێنانێكی نوێ ناسرا.

١٨٦٤- ئيميل برای ئەلفرێد مرد، لە كاتی ئامادەكردنی نترۆگليسريندا لە هيلينبۆرگ) Heleneborg) لە ستۆكهۆڵم، ئەلفرێد نۆبڵ بەردەوام بوو لە تاقيكردنەوەكانی و (ئەی بی نترۆگليسرين) (AB Nitroglycerin)ی دامەزراند لە ستۆكهۆڵم.

١٨٦٥- ئەلفرێد نۆبڵ باشتر بوو لە تەقاندنەوەی كلاّوەی تەقەمەنيدا، چوو بۆ ئەڵمانيا بۆ ئامادەكاری كۆمپانيای ئەلفرێد نۆبڵ، كارگەيەكی لە كروميل(Krummel) لە نزيك هامبۆرگ (Hamburg) دامەزراند.

١٨٦٦- كۆمپانيای تەقاندنەوەی لە ويلايەتەيەكگرتووەكانی ئەمريكا دامەزراند . تەقينەوەيەكی گەورە دارستانەكانی كروميلی لە ناوبرد، ئەلفرێد نۆبڵ ويستی نترۆگليسرين زياتر پارێزەربێت و ئەو دۆزينەوە نوێيانەی كردييە سەر دۆزينەوەكەی كيسلگر

(Kieselguhr)، نترۆگلیسرینی گۆڕی بۆ هەویرێك کە دەتوانرا بشێلرێت کە پێی دەوترا داینامیت (Dynamite) .

١٨٦٧- ئەلفرێد نۆبڵ وەك داهێنەری داینامیت ناسرا.

١٨٧٠- کۆمپانیای سۆسایتی جەنراڵ (societe genrral.co) ی دامەزراند بۆ بەرهەمهێنانی داینامیت لە پاریس.

١٨٧١-کۆمپانیای بریتش داینامیت (British Dynamite.co)ی لە ئاردیر (Ardeer) لە سکۆتلەند(Scotland)ی بەریتانیا دامەزراند، ساڵی ١٨٧٧ ناوی کۆمپانیاکە گۆڕا بۆ کۆمپانیای نۆبڵی تەقەمەنی (Nobel's Explosives Co).

١٨٧٢- ئەمانوئێلی باوکی ئەلفرێد نۆبڵ کۆچی دوای کرد.

١٨٧٣- لە تەمەنی ٤٠ ساڵیدا ئەلفرێد نۆبڵ بوو بە پیاوێکی دەوڵەمەند، چوو بۆ پاریس لە مالاکۆف (Malakoff) جێگیر بوو، دروستکردنی سەرەتای داینامیت و نترۆگلیسرین دەستی پێکرد.

١٨٧٥- ئەلفرێد نۆبڵ تەقاندنەوەی جیلاتین (Gelatine)ی لە پاریس داهێنا، کە بە داهێنانی ئەو ساڵی ١٨٧٦ ناسرا.

١٨٧٦- داینامیت ئاکین گیسلشافت (دی ئەی جی) (Dynamit Akien Gesellschaft DAG) کە پێشتر کۆمپانیای ئەلفرێد نۆبڵ بوو لە هامبۆرگ پێکهات.

١٨٨٠- داینامیت نۆبڵ (Nobel-Dynamite) پێکهات بە تێکەڵکردنی کۆمپانیاکانی نۆبڵ لە ئیتاڵیا و سویسرا (Switzerland).

١٨٨١- ئەلفرێد نۆبڵ خانووبەرە و تاقیگەیەکی کڕی لە سیڤران (Sevran) لە دەرەوەی پاریس.

١٨٨٥- یەکێتی ئەڵمانی (German Union) پێکهات بە یەکگرتنی داج و کۆمەڵێك کۆمپانیای داینامیتی ئەڵمانی.

١٨٨٦- کۆمپانیای نۆبڵ داینامیت تروستی (Nobel-Dynamite Trust co) لە لەندەن (London) بە ڕێکەوتنی داج و تەقەمەنی نۆبڵ پێکهات.

١٨٨٧- نۆبڵ تۆزی بلاستیت (Ballistite)ی داهێنا لە فەڕەنسا.

١٨٨٩-ئەندرێت ئاهسیل (Andriette ahlsell) دایکی نۆبڵ کۆچی دوایکرد.



١٨٩١- ئەلفرێد نۆبڵ پاریسی بەجێهێشت لە سان ریمۆ(San Remo)ی ئیتاڵیا جێگیر بوو.پاش دروست بوونی گێرمەو کێشە لە ناو حکومەتی فەڕەنسیدا لەسەر بلاستیت.

١٨٩٣ - ئەلفرێد نۆبڵ راگنار سۆلمان (Regnar Sohlman)ی بەکرێ گرت، کە بە رزگار کەری وەسیەتەکەی ناسراوە.

١٨٩٤- ئەلفرێد نۆبڵ ئامێرێکی بچووکی کڕی بۆ کارکردن لە سوید داینا .

١٨٩٥- سێهەم و کۆتایی ئیمزاکردنی (نووسینی وەسیەتنامە) ئەلفرێد نۆبڵ .

١٨٩٦- ئەلفرێد نۆبڵ لە ١٠ ی کانوونی یەکەمی ١٨٩٦ لە ماڵەکەی خۆیدا لە سان ریمۆی ئیتاڵیا کۆچی دوایکرد.

## کار و ژیانی ئەلفرێد نۆبڵ Alfred Nobel's Life and Work




لە ستۆکهۆڵم لە دایك بووە، لە ٢١ ی تشرینی یەکەمی ١٨٣٣، کە بووە زانایەکی بەناوباگ و داهێنەر و پیاوێکی بازرگان و دامەزرێنەری خەڵاتی نۆبڵ. باوکی ئەمانوئێل نۆبڵ و دایکی ئەندرێت ئاهسیلّ، کە ناوی کوڕەکەیان نا ئەلفرێد

باوکی ئەلفرێد ئەندازیار و داهێنەربوو، لە بنیاتنانی پرد و تەلار و راکێشانی رێگا و بان و تەقاندنەوەی بەرددا، لە هەمان ساڵدا کە ئەلفرێد لە دایك بوو. باوکی تووشی زەرەر و زیانێکی گەورەهات. باوکی لە ساڵی ١٨٣٧ دا بڕیاریدا هەوڵبدات بۆ دۆزینەوەی کار لە شوێنێکی تردا، و ڕووی کردە فنلەندا و روسیا، دایکی ئەلفرێدی بەجێهێشت تا چاودێری منداڵەکان و خێزانەکەی بکات، لەم کاتەدا ئەلفرێد دوو برای لە خۆی گەورەتری هەبوو، ڕۆبەرت لە دایك بووی ١٨٢٩، لۆدڤیگ لە دایك بووی ١٨٣١.



ئەو خانووەی ئەلفرێدی تیا لە دایك بوو

ئەندرێت نۆبڵ کە لە خانەوادەیەکی دەوڵەمەند بوو، توانی بە داهاتێکی کەم یارمەتی خێزانەکەی بدات، و بەخێویان بکات.



Andriette Nobel ئەندرێت نۆبڵ



Immanuel Nobel ئەمانوئێل نۆبڵ



## خێزانەکەی چوون بۆ روسیا

پاش ماوەیەك کە ئەمانوئێل کاری کرد لە سات پەترسبەرگ، بە شێوەیەکی باش کاریکرد، سازنگەیەکی (وەرشە) میکانیکی کردەوە کە ئامێری دەدا بە سوپای روسی، وایکرد کە قەیسەری روسی و سوپاسالارەکانی بڕوابهێنن بەوەی کە مینی دەریایی دەتوانرێت بەکاربهێنرێت بۆ بەرگرتن لە کەشتییەکانی دوژمن لە هاتنە ناوەو هێرش بۆ سەر سات پەترسبەرگ، تۆپەکانی دەریای پاشایەتی بەریتانی راوەستان بۆ گەیشتنە ماوەی هەڵدانی تۆپەکانیان بۆ سات پەترسبەرگ لە کاتی شەڕی قرمدا (Crimean) ساڵانی ١٨٥٣ - ١٨٥٦ . بە سەرکەوتنی لە روسیا ئەمانوئێل توانی خێزانەکەی بهێنێت بۆ سات پەترسبەرگ. لە ساڵی ١٨٤٣ دا کوڕێکی تر لە دایك بوو، بە ناوی ئیمیل، هەرچوار براکە خوێندنێکی پلە یەکیان وەرگرت. بە دابینکردنی مامۆستای تایبەت. کە وانەکانی زانستی سروشتی و زمانەکان و وێژە بوو، لە تەمەنی ١٧ ساڵیدا ئەلفرێد توانی بە ئەڵمانی و روسی و ئینگلیزی و سویدی قسە بکات و بنووسێت.



ئەمانوئێل نۆبڵ لە کاتی تاقیکردنەوەدا

## ئەلفرێد چوو بۆ دەرەوە

ئەلفرێد گرنگی دەدا بە وێژە و کیمیا و فیزیا، باوکی دەیویست کوڕەکەی بە رێڕەوەکەی ئەودا بڕوات و خۆشی لێنەدەهات بەوەی کە ئەلفرێد گرنگی بە شعر دەدات، بڕیاریدا ئەلفرێدی لاو بنێرێت بۆ دەرەوە بۆ خوێندن تا ببێتە ئەندازیاری کیمیا.



Young Alfred ئەلفرێدی لاو

له پاریس ئەلفرێد له تاقیگەی تایبەتی مامۆستا تی. جی.پیلۆز دەرمانسازی بەناوبانگدا کاریکرد، لەوێ دەرمانسازی ئیتالّی لاو ئاسانیۆ سابرۆر، پێش سێ ساڵ سابرۆل لوێ نترۆگلیسرینی داهێنابوو، کە شلەیەك بوو بە خێرای دەتەقییەوە، بە زۆر ترسناك دەژمێردرێت لە بەر ئەوە لە بەکارهێنانی زانستیدا بەکاردێت، ئەلفرێد زۆر بایەخی بە نترۆگلیسرین دەدا چەند دەتوانرێت بەکاربێت لە بنیاتناندا، کاتێك گەڕایەوە بۆ روسیا پاش تەواوکردنی خوێندن، لەگەڵ باوکیدا پێکەوە کاریانکرد بۆ گەشەپێدانی نترۆگلیسرین وەك ماددەیەکی تەقینەوە بە شێوەیەکی بازرگانی و تەکنیکی.

## گەڕانەوە بۆ سوید

پاش کۆتایهاتنی جەنگی قرم، کارەکەی ئەمانوئێل بە شێوەیەکی خراپ رۆیشت بۆیە بڕیاری گەڕانەوەیدا بۆ سوید، برا گەورەکانی ئەلفرێد رۆبەرت و لۆدڤیگ لە روسیا مانەوە بە مەبەستی کارێکی باش بۆ خێزانەکەیان، سەرکەوتوو بوون و بەردەوام بوون بۆ پێشخستنی پیشەسازی نەوت لە بەشی باشووری روسیا، پاش گەڕانەوەی خێزانەکەی نۆبڵ بۆ سوید لە ساڵی ۱۸٦۳. ئەلفرێد جەختی لەسەر پێشخستنی نترۆگلیسرین وەك ماددەیەکی تەقەمەنی کردووە، بە دڵتەنگییەوە ئەم تاقیکردنەوەیە بووە هۆی لە ناوبردنی ژمارەیەك خەڵك، لە نێویاندا برابچووکەکەی ئەلفرێد ئیمیل، بۆیە حکومەت بڕیاریدا بە یاساغکردنی ئەم تاقیکردنەوەیە لە سنووری شاری ستۆکهۆڵمدا.

ئەلفرێد وازینەهێنا لە تاقیکردنەوەکانی، تا نترۆگلیسرین بگۆڕێت بۆ ماددەیەك کە زیاتر ئەمانی تیا بێت کەمتر ترسناکبێت لەسەر مرۆڤ.





تاقیکردنەوە کانی لە دەریای Mälaren مالارین

## داهێنانی ئەلفرێد "داینامیت" "Dynamite"

ئەلفرێد لە رێگەی تاقیکردنەوەکانییەوە، نترۆگلیسرین لەگەڵ لمی ورد تێکەڵەیەکی وەك هەویرێکی شلی لێپێك هێنا کە دەتوانرا تولّی لێدروستبکرێت، کە ئەم تولّانە دەتوانرا ببرێت بۆ هەڵکەندنی چاڵ، ئەم داهێنانە لە ساڵی ۱۸٦٦دا بە ئەنجام گەیشت. پاش ساڵێك لە لایەن پاشایەتی سویدەوە مافی داهێنانی ئەم ماددەیە بە ئەلفرێد درا.

ئەم داهێنانە بە شێوەیەکی بەرفراوان بەکارهات لە هەڵکەندندا، پارمەتیدا و بڕی تێچوونەکەی کەمترکردەوە لە بنیاتنانی خانووبەرەکاندا، وەك هەڵکەندنی نەفەق و تەقاندنەوەی بەرد، بنیاتنانی رێگەوبان و پردەکاندا بەکارهات.

## کارگە لە شوێنە جیاوازەکان

داینامیت و کلّاوەی تەقەمەنی داوایەکی زۆری لەسەربوو لە کاری بیناسازیدا، بە هۆی ئەمەوە ئەلفرێد توانی کارگە لە ۹۰ شوێنی جیاواز بکاتەوە، لە پاریس دەژیا، بەلّام سەردانی کارگەکانی دەکرد، کە لە زیاتر لە ۲۰ ولّاتدا کردبوونییەوە. کە بە شێوەیەکی چڕ لە سوید (ستۆکهۆڵم و کارڵسکۆگ)، ئەڵمانیا (هامبۆرگ)، سکۆتلەندا (ئاردێر)، فەڕەنسا (پاریس و سیڤران)، ئیتالّیا (سان ریمۆ) کاری دەکرد، تاقیکردنەوەی کرد بۆ دروستکردنی لاستیکی پیشەسازی و حەریری پێستی، تا کاتی مردنی ساڵی ۱۸۹٦، ۳٥٥ داهێنانی هەبوو.



Bertha von Suttner

بێرسا ڤۆن سوتنر

## گەیشتن بە بێرسا ڤۆن سوتنر Bertha von Suttner

ئەلفرێد خێزانێکی دەوڵەمەندی هەبوو، رۆژی یەك شەمە لە رۆژنامەکاندا رایگەیاند کە سکرتێرەیەکی دەوێت، خانمێکی نەمساوی بە ناوی بێرسا ڤۆن سوتنر وەك سکرتێرە لەلای کاریکرد، پاش ماوەیەکی کەم کارکردن گەڕایەوە بۆ ئەوەی شووبکات، بەڵام بێرسا و ئەلفرێد وەك هاوڕێ مانەوە و نامەیان ئاڵوگۆڕ دەکرد چەند ساڵێك، کە پاشتر بوو بە هەڵسوڕاوێکی بزووتنەوەی ئاشتی، و کتێبێکی بەناوبانگی نووسی بە ناوی " چەکەکەت دانێ" Lay Down Your Arms ". بۆیە کاتێك ئەلفرێد نۆبڵ وەسیەتەکەی نووسی بۆ دامەزراندنی خەڵاتی نۆبڵ، لە نێویا ئەو کەسایەتی و رێخراوانەش دەگرێتەوە کە لە پێناو ئاشتیدا کاردەکەن.





رێورەسمی یەکەمی خەڵاتی نۆبڵ لە ١٩٠١ لە ئەکادیمیای پاشایەتی بۆ مۆسیقا لە ستۆکهۆڵم

## خەڵاتی نۆبڵ

ئەلفرێد لە سان ڕیمۆی ئیتاڵیا کۆچی دوایکرد لە ١٠ ی کانوونی یەکەمی ١٨٩٦، لە وەسیەتەکەیدا نوسیبووی کە زۆربەی سامانەکەی بەکاربهێنرێت و ببەخشرێت بەو کەسانەی کە کار لە پێناو مرۆڤایەتیدا دەکەن، لە بواری فیزیا و کیمیا و وێژە و نوژداری و ئاشتیدا، هەموو کەسێك دڵخۆش نە بوون بەمە، وتووێژ لە نێوان کەسە نزیکەکان و دەسەڵاتدا دروست بوو، چوار ساڵی خایاند تا هەموو لایەك رازیبوون بەوەی کە ئەلفرێد نۆبڵ ویستبووی. بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٩٠١ دا خەڵاتەکان لە بواری فیزیا و کیمیا و وێژە و نوژداریدا لە ستۆکهۆڵم و ئاشتی لە ئۆسلۆ بەخشران.

## شانشینی سوید Konungariket Sverige

### سوید Swed:

شانشینی سوید، بە سویدی (Konungariket Sverige)، یەکێکە لە وڵاتەکانی ئەسکەندناڤیا کە دەکەوێتە باکووری ئەورووپاوە. سوید بە سروشتە جوانەکەی بەناوبانگە لەگەڵ سیستەمێکی کۆمەڵایەتی دامەزراو، و ئەندامی یەکێتی ئەورووپایە. لە ڕۆژئاوایەوە نەرویژ لە ڕۆژهەڵاتییەوە فنلەندا لە باکووری ڕۆژئاوای دەریای کاتیگان و کەنداوی سکاکیراك لە باشووری ڕۆژئاوای. پایتەختەکەی ستۆکهۆڵمە کە گەورەترین شاریەتی دەکەوێتە سەر دەریای بەڵتیك کە ژمارەیەك دورگەی بچووك سەربەون دوور لە ڕۆخی دەریا، شەش یەکی دانیشتوانی سوید لە ستۆکهۆڵم و دەوروبەری دەژین.

دانیشتووان: ٧٦٪ سویدییەکان لە ناوچە شارنشینەکاندا دەژین و ١٤٪یان لە ناوچە لادێنشینەکاندا دەژین، بەهرەمەندن لەسەرجەم پێداویستییەکانی شارنشینەکان. لە ئەنجامی ئەو سیستەمە کۆمەڵایەتییەوە کە لەسویدا پەیڕەو دەکرێت. سوید بەیەکێك لە وڵاتانی یەکێتی ئەورووپایی دەژمێردرێت، کە کەمترین ڕێژەی دانیشتووانی هەیە. چڕی دانیشتووانی لە باکوور کەمترە تابەرەو باشوور بڕۆین زیاد دەکات، لەم وڵاتەدا کۆچبەر زۆرە فنلەندی نزیکەی نیوملیۆن کەسە، کۆچ بەری موسوڵمان لە تورك و یۆگۆسلاڤی و عەرەب و پاکستانی کەکەمینەیەکی موسوڵمانیان دروستکردووە.

دین: لە ٨٧٪ ی دانیشتووانی سەر بە کەنیسەی لۆسەری کاسۆلیکین، لەگەڵ یەهودی و ئەرسەدۆکس و موسوڵمان کە باقی دانیشتووانی سوید پێك دەهێنن.

مێژوو: لە سەدەی حەوتەم تا نۆهەمی زاینی لە دەوری ئۆپسالا چەق بەستنێك دروست بوو کە سەرەتای دەرکەوتنی وڵاتی سوید بوو، یەکێتی کاڵمار لە ساڵی ١٣٩٧ دامەزرا، کەلە هەرسێ وڵاتی ئەسکەندناڤی سوید نەرویژ دانیمارك پێکهات، مەلیك دەسەڵاتی ڕەهای بەسەر وڵاتدا هەبوو، رزگاری کرد لە ژێر دەسەڵاتی دانیمارك ساڵی ١٥٢٣، و بە شێوەیەکی لەسەر



خۆ بوو بە یەکێك لە وڵاتانی گەورەی ئەورووپا، تا ساڵی ١٧٢١ کە جەنگی باکوور (١٧٠٠-١٧٢١) لە بەرامبەر روسیادا دۆڕاندی، کە لەمیانیدا سازشی کرد لەسەر چەند ناوچەیەك لە دەریای بەڵتیك، توانی بەر بەناپلیۆن بگرێت و لەگەڵ نەرویژ یەکێتییەك دروست بکەن ساڵی ١٨١٢. لەو ڕۆژەوە تا ئەمڕۆ سوید سیاسەتێکی بێلایەنانەی پەیڕەو کردووە لە پێناو خۆشگوزەرانیدا. لە جەنگی جیهانی یەکەمدا (١٩١٤- ١٩١٩) بێلایەنی تەواوی خۆی ڕاگەیاند، پاش تەواوبوونی جەنگ ساڵی ١٩٢٠ پابەند بوو بە کۆمەڵەی گەلانەوە. دووبارە بێلایەنی خۆی ڕاگەیاند لە جەنگی جیهانی دووەمدا (١٩٣٩-١٩٤٥) کە رزگاری بوو لە داگیرکاری ئەڵمانیا، بوو بە ئەندامی نەتەوە یەکگرتووەکان ساڵی ١٩٤٦، ئەندامی دامەزرێنەری ڕێخراوی(OEEC) ئەورووپایە ساڵی ١٩٤٨، ساڵی ١٩٤٩ بوو بە ئەندامی ئەنجوومەنی ئەورووپا، ساڵی ١٩٥٢ ئەنجوومەنی باکوور و ساڵی ١٩٦٠ لە ڕێکخراوی بازرگانی ئازادی ئەورووپی(EFTA) دا بوو بەئەندام. هامار سکۆڵد(Hammarskjold) ی سویدی ساڵی ١٩٥٣هەڵبژێردرا بۆ سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان، دەستووری نوێ سوید ساڵی ١٩٧٥ ل ەبەرژەوەندی حکوومەت لە دەسەڵات و توانای شای کەم کردەوە، لە ساڵی ١٩٨٦ تیرۆرکردنی سەرۆك وەزیران ئۆلاف پاڵمە (Palma) سیاسەت و کۆمەڵگای سویدی هەژاند کە هەتا ئێستاش تیرۆرستەکە نەناسراوە.

سیستەمی سیاسی: سوید پاشایەتی دەستورییە، مەلیك سەری وڵاتە بەڵام کەسایەتییەکی ڕەمزییە، حکوومەت دەسەڵاتی جێبەجێکار بەڕێوەدەبات کە سەرۆکایەتی دەکرێت لە لایەن سەرەك وەزیرانەوە و ئەندامانی ئەنجوومەنی وەزیرانیش بەڕێوەدەبات، پەڕلەمان لە سویددا بە ناوی (رکسداج) ناودەبرێت، کە یەك ئەنجوومەنی یاسادانانە و لە ٣٤٩ ئەندام پێکدێت، پەڕلەمان لێپرساوێکی فەرمی بە ناوی (ڕەقیب) دادەمەزرێنێت بۆ پاراستنی هاوڵاتیان لە بەکارهێنانی نایاسایی یان ناپەسەندی دەسەڵات لەلایەن دەسەڵاتدارانەوە یان لەلایەن کارمەندانی حکوومەتەوە. بەمە یەکەم دەوڵەتە کار بەم سیستەمە دەکات، سوید لە ٢٤ کانتۆن پیك دێت، بۆ هەر یەکێکیان حکوومەتێك هەیە، دادگای باڵا بەرزترین دادگایە لە وڵاتدا، کە چاودەخشێنێتەوە بە تێهەڵچوونەوەی کۆتایی کێشەی مەدەنی و تاوانی گرنگدا.

سیاسەتی دەرەوە: سوید سیاسەتێکی بێلایەن و تەندروستی گرت لە جەنگە جیهانییەکان و سیاسەتە نێودەوڵەتییەکاندا، بەڵام بەتوندی دژی جەنگی ڤێتنام بوو، کە بووە هۆی ئەوەی لە ساڵی ١٩٦٨ دا ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پەیوەندی دبلۆماسی لەگەڵدا بپچڕێنێت،

ویستی بەستەڵەکی جەنگی سارد بشکێنێت وە پاشتردانی نا بە ڤێتنامی باکووردا ساڵی ١٩٦٩، پەیوەندی دبلۆماسی لەگەڵ ئەڵمانیایی خۆرهەڵاتدا دامەزراند ساڵی ١٩٧٢، بە پابەند بوو بە یەکێتی ئەوروپاوە ساڵی ١٩٩٥.

ئابووری و ژێرخان: سوید دەوڵەتێکی پیشەسازی پێشکەوتووە، ئابوورییەکەی پڕە لە تەلاری ئەندازەیی و پڕە لە سەرچاوەکانی خزمەتگوزاری، نزیکەی ٩٠٪ لە پیشەسازییەکەی خاوەندارێتی تایبەتە، و خاوەندارێتی گشتی (دەوڵەت)کانەکان و گەیاندنی گشتی و وزە پێک دەهێنێت، پیشەسازی نزیکەی ٣١٪ ی بەرهەمی نەتەوەیی پێکدەهێنێت، هەروەك ٦٥٪ی پیشەسازی خزمەتگوزاری و ٤٪ی کشتوکاڵ پێکدەهێنێت. سوید دەوڵەمەنترین وڵاتە لە ئاستی خامی ئاسندا و لە ٨٪ی ئاسنی جیهانی دەنێرێتە دەرەوە، جگە لە خامی مس و ئالتون و قورقوشم و زیو، سوید بەوە جیا دەکرێتەوە کە هەناردەکانی زیاترە لە هاوردەکانی، هەناردەی برێکی زۆر زیاد دەکات لەوانە کاغەز و لاتستورد، گرنگترین بەرهەمەکانی نەوت و بەرهەمی کشتوکاڵییە، پەیوەندی بازرگانی لەگەڵ ئەڵمانیا و بەریتانیا و ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و نەرویژ و دانیمارکدا هەیە، کە یەکێتییەکی بازرگانی ئازادی باشی دروستکردووە. دارستانەکان بەرهەمێکی ئابووری گرنگیان بۆ سوید دروست کردوە، کەلە ٤٥٪ ی هەناردەکانی پێکدەهێنێت، کە تەختەی لێبەرهەم دەهێنێت جگە لە وەرەقە و ناومال و سلیلۆز و خەڵوز و بۆیاخ، وەهەندێك کیمیاویات. زەوی کشتوکاڵی لە ١٠٪ ی رووبەری وڵات پێك دەهێنێت، و سوید بایەخ بە بەخێوکردن و بەرهەمی ئاژەڵ دەدات، کە لە باشور چەقی بەستووە.

خوێندن و رۆشنبیری: خوێندن بۆ منداڵان بە زۆرە لە تەمەنی (٧-١٦) ساڵ، خوێندنی سەرەتای و ناوەندی بێبەرامبەرە، خوێندنی زمانی ئینگلیزی زۆرەملێیە لە تەمەنی دەساڵییەوە، لە سویدا شەش زانکۆ هەیە، کە پێشکەوتووترینیان لە ئۆپسالایە لە ساڵی ١٤٧٧ بنیاتنراوە.








| شانشینی سوید Konungariket Sverige | |
|---|---|





| | |
|---|---|
| زمانی فەرمی | سویدی |
| پایتەخت | ستۆکهۆڵم |
| گەورەترین شار | ستۆکهۆڵم |
| شێوازی بەڕێوەبردن | پاشایەتی دەستووری |
| سەرۆکی وڵات | شا کارڵ گوستاڤی شازدەهەم |
| سەرۆکی حکوومەت | گوران بیرسون |
| رووبەر | ٤٤٩,٩٦٤ کیلۆمەتر چوارگۆشە |
| ژمارەی دانیشتووان | ٩,٠٠٦,٤٠٥ بۆ ساڵی ٢٠٠٥ |
| چڕی دانیشتووان | ٢٠کەس بۆ ١کم چوارگۆشە |
| دراو | کرۆنی سویدی SEK |
| سەرجەمی داهاتی نەتەوەیی | ٢٦٧ملیار دۆلاری ئەمریکی بۆ ساڵی (٢٠٠٥) |
| داهاتی تاکەکەس | ٢٩,٥٤٤دۆلاری ئەمریکی بۆ ساڵی (٢٠٠٥) |
| جیاوازی کات | UTC+١ (ڕێخستنی کاتی جیهانی) |
| سلاوی نیشتیمانی | Du Gamla, Du Fria |
| نیشانەی ئۆتۆمۆبێل | S |
| نیشانەی ئینتەرنێت | se. |
| نیشانەی تەلەفۆن | ٤٦+ |

## شانشینی نەرویژ   Konungariket Norge

### نەرویژ Norge

نەرویژ لە سەدەی دووەمی بەر لە زاینەوە دانیشتووان تیا ژیاوە لەلایەن خێڵەکانی فایکنگەوە، و مەلیك هارالّد شونهارس دەستی گرت بەسەر خێڵەکەدا و توانی لە ساڵی ٨٧٢ی زایەنیدا وڵات یەکبخات. کە بەخێرایی دارِما. لە ١٠١٥ بۆ ١٠٣٠ یەکگرتنەکە (یەکخستنەوە) بەکۆتایی گەیشت و دینی مەسیحی هاتە ناو وڵاتەوە، لە نێوان ساڵەکانی ١٣٤٠ بۆ ١٨١٤ نەرویژ و ئایسلەندە و گریلاند لەگەڵ دانیمارك یەکیانگرت لە ژێر سایەیی مەلیکی دانیمارکدا، لە ١٨١٤/٥/١٤ نەرویژ سەربەخۆیی خۆی ڕاگەیاند بە کاریگەری دەست لێهەڵگرتنی دانیمارك بۆ سوید پاش شکستی جەنگەکانی یەکەمی ناپلیۆن، و بە کاریگەری ئەمە سوید نەرویژی داگیرکرد و ڕایگەیاند کە شای سوید شای ئەویشە. بەکاریگەری ململانێ سیاسییەکان لە ساڵی ١٩٠٥دا نەرویژییەکان بە زۆرینەی زۆری دەنگ دەنگیان بۆ هەڵوەشاندنەوەی یەکێتییەکەدا لەگەڵ سویددا و ڕایانگەیان کە شای دانیمارك شای ئەوانە. لە جەنگی جیهانی یەکەمدا بە بێلایەنی مایەوە و پاش جەنگ بە کۆمەڵەی گەلانەوە پەیوەست بوو ساڵی ١٩٢٠، ساڵی ١٩٢٥ ناوی پایتەختەکەی گۆڕی لە کریستیانیا و بۆ ئۆسلۆ. لە جەنگی جیهانی دووەمدا ئەڵمانیا داگیریکرد. پارتی کار حکوومەتی پێکهێنا لە ساڵی ١٩٤٥ پاش کۆتایهاتنی جەنگ و ئازادکردنی وڵات لە دەست ئەڵمانیا. وەزیری دەرەوەی نەرویژ تریگڤ براتیل Trygve Bratteli بووبە یەکەم سکرتێری نەتەوە یەکگرتووەکان، و نەرویژ ئەندامی دامەزرێنەری پەیمانی باکووری ئەتڵەسییە (ناتۆ) لە ساڵی ١٩٤٩ دا. گەلی نەرویژ لە ڕاپرسی گشتیدا ڕەتیانکردەوە، کە بچنە ناو یەکێتی ئەوروپاوە لە ساڵی ١٩٧٢ و ساڵی ١٩٩٤.

شانشینی نەرویژ دەکەوێتە باکووری کیشوەری ئەوروپاوە (ئەسکەندناڤیا)، هاوسنوورە لەگەڵ سوید، فنلاندا، روسیا، و دانیمارك، بەریتانیا بە سنووری ئاوی. نەرویژ بە زنجیرەیەك شاخی نزم



داپۆشراوە و بە زەریای ئەتڵەسی دەورەدراوە کە ژمارەیەك کەنداوی قوڵی بۆ پێکهێناوە درێژی کەناراوەکانی دەگاتە ٢٠٠٠٠ کم. خاکی نەرویژ لە شێوەی لاکێشەیەکی تەسکدا درێژبۆتەوە کە درێژییەکەی ٢٦٥٠ کم، ژمارەیەکی زۆر دورگەی بچووك کە بەدرێژی کەناراوەکانی دراوسێین لەسەر خاکی نەرویژ حسابدەکرێن. ٣٠٪ ی خاکەکەی بۆ کشتوکاڵ سوودی لێوەردەگیرێت. بەرزترین لوتکە ناوی (کالدهبنین)ە بەرزییەکەی ٢٤٦٩ م. ٧٥٪ی دانیشتووانی لە شارەکاندا دەژین، تابەرەو باکوور بڕۆین چڕی دانیشتووان کەمتر دەبێتەوە٦ ٩٥٪ دانیشتووانەکەی نەرویژین، دابەشبوونی دانیشتووان جیاوازییەکی بەرچاوی هەیە لە ناوچە کەنارییەکاندا زۆرترە. پێنج یەکی دانیشتووانەکەی لەسەر کشتوکاڵ دەژین، داهاتی ئاژەڵی پێویست بەشی بەکارهێنانی ناوخۆ بەرهەم دێنێت. سەروەتی تەختە جێگایەکی گرنگی لە ئابووری وڵاتدا هەیە ساڵانە ١١ ملیۆن مەتری چوارگۆشە بەرهەم دەهێنێت. نەرویژ یەکەم دەوڵەتی ئەوروپییە لە ڕاوکردنی ماسیدا. نەرویژ کەشتیگەلێکی گەورەی هەیە، یەکێکە لە کەشتیگەلە گەورەکانی دنیا.

زمانی نەرویژی زمانی فەرمی وڵاتە کە لە زمانەکانی جەرمانی باکوورەوە وەرگیراوە و کاریگەرە بە شێوەی زمانی ئەڵمانی کۆن و دابەش دەکرێت بۆ دووبەش بۆکمال (Bokmål) کاریگەر بە زمانی دانیمارکی و نینۆرسك ((Nynorsk، 84%ی نەرویژییەکان بە زمانی یەکەم دەنووسن، لە قوتابخانەکاندا زمانی ئینگلیزی بە زۆرەمێیە و ئەڵمانی و فەرەنسی بە ئارەزوومەندانەیە. دینی نەرویژی بە ئەنجلیکانی لۆتەری ناسراوە کە ٨٦٪ی شوێنیکەوتوون و پرۆتستانت و کاسۆلیك ٤,٥٪ و ٢٪ ئیسلام ١٪ ئاینیتر و ٧,٥٪ بێ دین.








| Konungariket Norge شانشینی نەرویژ | |
|---|---|
|  |  |
| زمانی فەرمی | نەرویژی |
| پایتەخت | ئۆسلۆ |
| گەورەترین شار | ئۆسلۆ |
| شێوازی بەڕێوەبردن | مەلیکی دەستووری |
| سەرۆکی وڵات | مەلیك هارالّدی پێنجەم |
| سەرۆکی حکومەت | یەنس ستولتنبەرگ |
| رووبەر | ٣٨٥،١٩٩ کیلۆمەتر چوارگۆشە |
| ژمارەی دانیشتووان | ٤،٥٩٣،٠٤١ کەس |
| چڕی دانیشتووان | ١٤ کەس بۆ ١کم چوارگۆشە |
| دراو | کرۆنی نەرویژی (NOK) |
| سەرجەمی داهاتی نەتەوەیی | ٢٩٦ ملیار دۆلاری ئەمریکی |
| داهاتی تاکەکەس | ٦٤،١٩٣ دۆلاری ئەمریکی |
| جیاوازی کات | +١ UTC(رێخستنی کاتی جیهانی) |
| نیشانەی ئۆتۆمۆبێل | N |
| نیشانەی ئینتەرنێت | .bv ،sj. ،no. |
| نیشانەی تەلەفۆن | ٤٧+ |

## هیچ سویدییەك نییە لە ئەلفرێد نۆبڵ ناودارتربێت لە دونیادا

لە ساڵی ١٨٣٣ لە ستۆکهۆڵم لە خێزانێکی ئەندازیار لە دایك بووە. خێزانەکەی لە هیچەوە پێشکەوتن، جگە لە ولۆف رودبیك Olof Rudbeck باشترین زانای تەکنیکی ناسراوی سویدی سەدەی حەڤدەهەم، کە وەك هێزێکی گەورە لە باکووری ئەوروپا دەرکەوت. کاتێك ئەلفرێد لە تەمەنی ٥ ساڵیدا بوو باوکی ئەمانوئێل چوو بۆ سات. پەترسبەرگ St.Petersburg کەلەوێ سازنگەیەکی میکانیکی دروستکرد بۆ دروستکردنی مینی دەریایی، کاتێك ئەلفرێد بووبە ٩ ساڵ سەرجەم خێزانەکەی چوون بۆ سات. پەترسبەرگ، لەوکاتەدا دارای باوکی باش بوو. کە خێزانەکەیان دەیان توانی بە شێوازی بۆرژوازی جیهانی بژین. لەوکاتەدا سات. پەترسبەرگ پایتەختێکی جیهانی زیندوو بە ژیانی رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و زانستی بوو. منداڵەکانی ئەمانوئێل نەچوونە قوتابخانە، بەڵام لە جیاتی ئەمە لە ماڵەوە فێری خوێندن بوون، بە فێرکاری دوو مامۆستا لە ئاستی مامۆستای زانکۆدا. ئەم کارە چڕبووەوە بە هەردوو زانستی مرۆیی و زانستی سروشتی. ئەلفرێد و براکانی فێری زمانی ئەڵمانی و ئینگلیزی و فەرەنسی و روسی بوون، سەرباری ئەدەب و فەلسەفە و زانستی سروشتی. لە ساڵی ١٨٥٠-١٨٥٢ ئەلفرێد چەند سەردانێکی بۆ دەرەوە ئەنجامدا، بە مەبەستی خوێندن، ساڵێکی لە پاریس لەگەڵ کیمیاسازی ناودار یۆلیس پیلۆوز Jules Pelouze کە پرۆفیسۆری کۆلێژێکی فەرەنسی بوو بەسەر برد. تاقیگەیەکی تایبەتی بە راهێنان دروست کردبوو. یۆلیس پیلۆوز بە شێوەیەکی رێکەوت هاوڕێیەکی باشی کیمیاسازی سویدی بێرزیلیوس Berzelius بوو. هەروەها مامۆستای نیکۆلای زینین Nikolai Zinin بوو. کە یەکێك بوو لە مامۆستا تایبەتەکانی ئەلفرێد، لە ماوەی ئەو ساڵەدا ئەلفرێد مەشقی تەواوی کرد وەك کیمیاساز.

ئەلفرێد نۆبڵ بەرگوێی کەوتبوو کە نترۆگلیسرین nitroglycerine تەقەمەنییەکی چاك و غەریبە. لە ساڵی ١٨٤٧دا لە تۆرین Turin ئاسکانیۆ سۆبریرۆ Ascanio Sobrero خوێندکاری ئیتاڵی کە قوتابی پیلۆوز بوو ماددەیەکی تەقەمەنی نوێی دۆزییەوە، سەرەتا بە ناوی پایرۆگلیسرین pyroglycerine و پاشان بەناوی نیترۆگلیسرین nitroglycerine ناسرا. وشیاری دەربارەی گیراوە نوێیەکەدا، نەك لەبەر ئەوەی هێزێکی تەقینەوەی سەرسوڕهێنەری هەیە، بەڵکە ئاستەمە مامەڵە لەگەڵکردن و تاوتوێکردنی. نزیکی ساڵی ١٨٣٠ پیلۆوز خۆی و ئەوانیتر کە لەگەڵی بوون تاقیکردنەوەیەکی ئامادەکاری گرنگیان ئەنجامدا. ئەلفرێد گرنگی بەتەقەمەنیدا، کە گرنگی پێدانێکی خێزانیش بوو. ئەوکاتەی کە



پیلۆوز وشیاری و ئاگایی راستەوخۆی هەبوو لە چۆنێتی تەقینەوە و دروستکردنی تەقەمەنی کە لە دۆزینەوەکەی سۆبیرۆ بۆی دەرکەوت. ئەلفرێد هاوکات فێربوو دەربارەی نترۆگلیسرین هەستی بە شێواوی کرد یەکسەر سەبارەت بە قورسی دروستکرن و تاوتوێکردنی گیراوە نوێیەکە.

کۆتایی جەنگی قرم Crimean ساڵی ١٨٥٦ کارەسات بوو. کارگەکەی ئەمانوئێل کە لە سەر کەرەسە و پێداویستییە سەربازییەکانی جەنگ دەژیا ئیفلاسی کرد. باوکی ئەلفرێد و کوڕە بچووکەکەی گەڕانەوە بۆ سوید، سێ کوڕە گەورەکەی لە سات. پەترسبەرگ مانەوە بەمەبەستی رێخستنەوەی باری خێزانیان و داڕشتنەوەی هەیکەلەی کۆمپانیاکەیان. لە ماوەی ساڵانی دەیەیی ١٨٦٠ دا ئەلفرێد نۆبڵ چەند تاقیکردنەوەیەکی یەك لە دوای یەکی ئەنجامدا کە سەرکەوتوو بوو لە دروستکردنی بڕی پێویست لە نترۆگلیسرین بەبێ هیچ کارەساتێك، پاشان نترۆگلیسرینی لەگەڵ بارودی رەش تێکەڵ کرد پاش چەند تاقیکردنەوەیەکی سەرکەوتوو لە دەرەوەی سات. پەترسبەرگ و لەسەر رووباری ناڤا Neva ی بەستوو تاقیکردەوە. ئەلفرێد گەڕایەوە بۆ ستۆکهۆڵم. لەوێ باوکی دەستی کردبوو بە تاقیکردنەوەی هاوشێوە. پاش خوێندنەوەی نامەکانی ئەلفرێد دەربارەی تاقیکردنەوەکانی. ئەمانوئێل پێداگری دەکرد، کە تێکەڵە نوێیەکە بیرۆکەی تایبەتی خۆیەتی، بەڵام پاش نامەیەکی توندی ئەلفرێد پاشەکشەی لەم بیرۆکەیەی کرد. پاشان یارمەتی ئەلفرێدیدا بۆ دەسکەوتنی مافی داهێنانەکەی بە ناوی تایبەتی خۆیەوە (ئەلفرێد). لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٨٦٣ دا ئەلفرێد مافی داهێنانی ماددەی تەقەمەنی پێدرا. لە تەمەنی ٣٠ ساڵیدا ئەلفرێد نۆبڵ مافی یەکەم داهێنانی بەدەستهێنا. کە ئەمە سەرەتای مانۆڕێکی خێرابوو، لە ماوەی بەهار و هاوینی داهاتوودا بەردەوام بوو لە تاقیکردنەوەکانی. بە بەکارهێنانی سندووقێکی تەقەمەنی پڕ لە بارودی خاڵیکراوە لە هەوا. لە هەمانکاتدا تایبەت مەندییەکی کەسایەتی تری دەستپێکرد، داهێنەرەکە بوو بە بزنزمان. لە ئەیلولی ساڵی ١٨٦٤ دا تەقینەوەیەکی سەرەکی لە کارگەکەی نۆبڵ



لە ستۆکهۆڵم روویدا کە بووە هۆی سپاردنی گیانی ئیمیل Emilی برای ئەلفرێد و چوار کیمیاسازی تر. لە ساڵی ١٨٦٥ دا کلاوەی تەقینەوەکەی باشترکرد لە جیاتی تەختە ئەم جارەیان کانزای بەکارهێنا. کە لە رووی مەبدەئییەوە تائێستا هەمان تەکنیکو جۆر بەکاردەهێنرێت تائەمرۆ. پاشان روویکردە ئەڵمانیا، کە کۆمپانیایەکی بنیاتنا لەوێ، هەندێك زەوی کڕی لە دەرەوەی هامبۆرگ، کە کۆمپانیاکەی لە سەر بیناکرد . لە هاوینی ساڵی ١٨٦٦ دا چوو بۆ ئەمریکا، ئەوکاتەی لە ئەمریکا بوو کارگەکەی لە ئەڵمانیا تەقییەوە، کاتێك گەڕایەوە بۆ ئەڵمانیا لە مانگی ئابی هەمان ساڵدا، سەرپەرشتی پاکردنەوەی پاشماوەی تەقینەوەکەی کرد و پلانی بینایەکی نوێی دانا لە هەمانکاتدا. بەردەوام بوو لە بیرکردنەوە لە گرفتەکانی دەست بەسەرا گرتنی نترۆگلیسرین، ژمارەیەك تاقیکردنەوەی نوێی ئەنجامدا. پەیی بەوە برد کە نترۆگلیسرین پێویستە هەڵبمژرێت لەلایەن هەندێك ماددەوە، کە تێکەڵەیەك پێك دەهێنێت ئاسانترە بۆ تاوتوێکردن. لەسەر خاکی ئەڵمانیا جۆرێك لمی دۆزییەوە کە بە دایتۆماسیوۆس diatomaceous کە لە ئەڵمانیا بە کیسلگور Kieselguhr ناسرابوو. کاتێك نترۆگلیسرین لەلایەن کیسلگور تێکەڵ بکرێت و هەڵبمژرێت هەویرێکیان لێپێك دێت کە ئاسانترە بۆ شێلان و شێوە لێ دروستکردنی. ئەم هەویرە دەتوانرێت شێوەی تولّی لێدروست بکرێت کە گواستنەوەی زۆر ئاسانترە و بەئاسانی دەبرێت بۆ شوێنی کارکردن، بەڵام کیسلگور لە هێزی تەقینەوەی نترۆگلیسرینەکەی کەم کردبووەوە، چونکە ماددەیەکی یاریدەدەری تەقینەوە نییە. ئەمەش داهێنانی داینامیت dynamite بوو کە ئەلفرێد نۆبڵ داهێنەریەتی. ئەلفرێد لە وشەی یۆنانی داینامیس dynamis ەوە وەریگرتووە کە بەواتای هێز دێت. یەکێك لە هاوکارە ئەڵمانییەکانی پێشنیاری (هەویری تەقەمەنی) blasting putty بۆ کردبوو، بەڵام ئەلفرێد رەتی کردەوە.

لە ساڵی ١٨٦٧ دا لە سوید و ئەمریکا و بەریتانیا بە شێوەیەکی گشتی وەك داهێنەری داینامیت ناسرا ئەلفرێد نۆبڵ. لە ساڵی ١٨٦٨ دا ساڵێك پاش داهێنانی یەکەم بۆ داینامیت، خەڵاتی ئەکادیمیای پاشایەتی سوید بۆ زانست پێبەخشرا. ئەم خەڵاتە کە ئەلفرێد زۆر رێزی لێدەگرت



خەڵاتی رێزلێنانی ئەکادیمیای پاشایەتی سوید بۆ زانست



تا ئاستێکی زۆر بەرزدا، دەبەخشرایە ئەو کەسانەی دۆزینەوەکانیان گرنگ بوایە لە روانگەی زانست و مرۆڤایەتییەوە .

## خواستی نۆبڵ the Will of Alfred Nobel



هەموو ئەو موڵکەی کە ماومە دەبێت بەم شێوەیەی لای خوارەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت: سەرمایەکە، لەلایەن جێبەجێکارانەوە بە شێوەیەکی راست و دروست لە بواری دراودا بەکاردەهێنرێت، و دەبێتە سەرچاوەیەکی دارایی و سوودەکەی ساڵانە بەشێوەی خەڵات دابەش دەکرێت بەسەر ئەوانەی کە لە ساڵانی دواییدا زۆرترین سوود بە مرۆڤایەتی دەگەیێنن. سوودە ناوبراوەکەش بەسەر پێنج بەشی هاوشێوەدا دابەش دەکرێت بەم شێوەیەی لای خوارەوە: بەشێکی بۆ ئەو کەسەی کە گرنگترین دۆزینەوە یان داهێنانی لە بواری فیزیادا ئەنجامداوە، بەشێکی دیکەشی بۆ ئەو کەسەی کە گرنگترین دۆزینەوەی کیمیایی یان چاکسازیی لەم بوارەدا ئەنجامداوە. بەشێکی دیکەش بۆ ئەو کەسەی کە گرنگترین دۆزینەوەی لە بواری فیسیۆلۆجیادا یان پزیشکییدا ئەنجامداوە. بەشێکی دیکەش بۆ ئەو کەسەی کە لە بواری ئەدەبییدا داهێنەر بووەو کارەکەی زۆر نموونەیی بووە. بەشێکی دیکەش بۆ ئەو کەسەی کە زۆرترین و چاکترین کاری کردووە بۆ بەدیهێنانی گیانی برایەتی لە نێو میللەتانداو رەتکردنەوە یان کەمکردنەوەی ژمارەی سوپا ئامادەکانو بانگەوازکردن و سازدانی کۆنفرانسی ئاشتی. خەڵاتەکانی فیزیا و کیمیا لەلایەن ئەکادیمیای سویدی بۆ زانستەکان دەبەخشرێت، بۆ بواری فیسیۆلۆجی و پزیشکی لەلایەن پەیمانگای کارۆلینسکا (karolinska institutet) لە ستۆکهۆڵم دەبەخشرێت، بۆ

کاری ئەدەبیش ئەکادیمیایەك لـە سـتۆکهۆلم دەیبەخـشێت، بـۆ پاڵـەوانانی ئاشـتی خەڵاتەکـە لەلایـەن کۆمیتەیـەکی پێـنج کەسـییەوە دەبەخـشرێت کـە لەلایـەن پەرلـەمانی نەرویژییـەوە هەڵدەبژێردرێت. هەر لە حەز و ئاواتی منەوەیـە کـە نابێـت گـوێ بدرێتـە ڕەگەزنامـەی ئـەو کەسانەی کە هەڵدەبژێردرێن بۆ وەرگرتنی خەڵاتەکە، بەڵکو ئەو کەسەی کە زۆر شایستەی ئـەو خەڵاتەیە دەبێت وەریبگرێت، جا ئایا خەڵکی وڵاتە ئەسکەندناڤییەکانە یان نا. دواین وەسیەتی نـۆبڵ لـە ٢٧ ی تـشرینی دووەمـی سـاڵی ١٨٩٥دا نووسـیویەتی. ئـەوەی کـە وایکـردووە ئـەم خەڵاتـە دابنێت خوێندنەوەی هەواڵی مردنـی خـۆی بـووە لـە ڕۆژنامەیـەکی فەرەنـسیدا، کە بـە دروسـتکەری مـردن ناوزەندی کردبوو. هەواڵەکە بەهەڵـە لـە جیـاتی نـاوی لۆدڤیگی برای نـاوی نـۆبڵی نووسـی بـوو. لـە وەسیەتەکەیدا نۆبـڵ ٤٩ ٪ ی دارایـی خـۆی تـەرخان کردبوو، بۆ ئەم خەڵاتە. لـە کـاتی مردنیـدا ٣٢ ملیـۆن کرۆنی سویدی هەبووە. ئـەم


No 73. År 1897 den 5 Februari uppvisat vid Stockholms Rådstufvurätts fjerde Afdelning; betygar ex officio Jacob Lindert

Testament

Jag undertecknad Alfred Bernhard Nobel förklarar härmed efter moget betänkande min yttersta vilja i afseende å den egendom jag vid min död kan efterlemna vara följande:
Mina Brorsöner Hjalmar och Ludvig Nobel, söner af min Broder Robert Nobel, erhålla hvardera en Summa af Två Hundra Tusen Kronor;
Min Brorson Emanuel Nobel erhåller Tre Hundra Tusen och min Brorsdotter Mina Nobel Ett Hundra Tusen Kronor;
Min Broder Robert Nobels döttrar Ingeborg och Tyra erhålla hvardera Ett Hundra Tusen Kronor;
Fröken Olga Boettger, för närvarande boende hos Fru Brand, 10 Rue St Florentin i Paris, erhåller Ett Hundra Tusen Francs;
Fru Sofie Kapy von Kapivar, hvars adresse är känd af Anglo-Oesterreichische Bank i Wien är berättigad till en lifränta af 6000 Florins Ö.W. som betalas henne af sagde Bank och hvarför jag i denna Bank deponerat 150,000 Fl. i Ungerska Statspapper.
Herr Alarik Liedbeck, boende 26 Sturegatan Stockholm, erhåller Ett Hundra Tusen Kronor;
Fröken Elise Antun, boende 32 Rue de Lübeck Paris, är berättigad till en lifränta af Två Tusen Fem Hundra Francs. Dessutom innestår hos mig för närvarande Fyratio åtta Tusen Francs henne tillhörigt kapital som äger att till henne återbetalas;
Herr Alfred Hammond, Waterford, Texas, United States, erhåller Tio Tusen Dollars;
Fröknarna Emmy Winkelmann och Marie Win-

سامانە موڵکەکانی لە پاریس و سان ڕیمۆ دەگرێتە خـۆی، هـەروەها پـشکە ماڵییـەکانی لـە بانکەکانی بەریتانیا و ئایسلەندا و فەرەنسا و ئەڵمانیا و ڕوسیا و سوید هەیبوو، مافی تۆماری داهێنانەکانی و سندووقی پارەکانی لە شەقامی ٥٢ ی مالاکۆن لە پاریس، دەگرێتەوە. هەموو ئەمانە سەروەتی نۆبڵیان پێك دەهێنا. نۆبڵ ژن و منـداڵی نـەبوو کـە مـرد ٢ ملیـۆن کرۆنـی سویدی تەرخانکرد بۆ منداڵەکانی خوشك و براکانی، و ژمارەیـەك لـە هاوڕێکانیـشی بێبـەش نەکردبوو لەم سامانە.



# Ragnar Sohlman - Executor of the Will (1870-1948)

## ڕاگنەر سۆڵمان –جێبەجێکاری وەسێتەکە (١٨٧٠-١٩٤٨)


ئەمە ڕاگنەرە لە تاقیگەکە ئەلفرێد نۆبڵ لە سان ڕیمۆی ئیتاڵیا

وەکو ئەندازیارێکی گەنجی کیمیایی، ڕۆگنەر کاری لە سـان ڕیمـۆی ئیتاڵیـا لـە تاقیگەکـەی ئەلفرێد نۆبڵ دەکرد، لەوە سیەتەکەیدا ئەلفرێـد نۆبـڵ ڕاگنــەر ســۆڵمان و ریــدۆڵفی وەك جێبەجێکەری وەسـیەتەکەی دانـابوو، هـەروەها دەیانزانی کە سامانەکانی ئەلفرێد نۆبڵ لە چەند وڵاتیکدا هەیە، ڕاگنەر سـۆڵمان و ڕۆدۆڵـف لـە سـەرەتادا بڕیاریانـدا کـە بەشـێکی زۆری ئـەم سامانانە بۆ سوید بگوێزنەوە، ئەم کارە ڕێگـیری کرا بـەوەی کـە دەسـەڵاتدارانی فەرەنـسا داوای پارەکەیان کردبوو گواستنەوەکەیان ڕاگرت، ئـەم دوو ئەندازیارە گەنجـە بـە شـێوەیەکی ئاسـایی بـە ئەسـپ و عارەبانـە چـوون بـۆ دەوروبـەری بانکەکان لە پاریس، هەموو ئەو بەڵگە و دۆکیومێنتانەیان کۆکردەوە کە پەیوەندی بە سـەروەت و سـامانەکەی ئەلفرێـد نۆبڵـەوە هـەبوو. پاشـان بەڵگەنامـەکان لـە کۆنتێنـەری گـەورەدا کۆکرانەوەو بە پاپۆڕ بۆ سوید گوێزرانەوە لە یەکێك لە وێستگە ئاسنینەکانی پاریسەوە کـە بـە شـێوەی کەلوپـەلی ئاسـایی تۆمـار کرابـوو. لـە سـوید سـۆڵمان ڕۆڵێکـی گرنگـی گێـڕا لـە جێبەجێکردنی وەسیەتەکەی نۆبڵدا، ئەو ڕۆڵێکی گرنگـی گێـڕا لـە دامـەزرانـدنی دامـەزراوەی نۆبڵدا و ڕێکخستنی هاوکارییەکانی ئەم دامەزراوەیە لەگەڵ پەیمانگەی بەخـشینی خەڵاتـەکان. پاشان ڕاگنەر سۆڵمان لە یەکێك لە کۆمپانیاکانی نۆبڵ لە سوید ئیشی دەکرد، AB Bofors Nobelkrut، لە ١٨٩٩-١٩١٩، بوو بە سەرۆکی جێبەجێکەری کۆمپانیایەکـە. لـە مـاوەی ١٩٢٩-١٩٤٦ ڕاگنەر خزمەتی وەکو بەڕێوەبەری گشتی دامەزراوەی نۆبڵ کردووە.

# TNT تی ئێن تی (ماددەیەکی کیمیاوییە)



| | |
|---|---|
| پێکهاتەی ماددەکە | |




| | |
|---|---|
| زانیاری گشتی | |
| ناو | ترای نیترۆ تولیۆین |
| شێوگی کیمیاوی | CH3(2NO)2H6C٣ |
| تایبەتمەندی | زەردە، وەك کریستاڵ وایە لە شێوەی دەرزیدا (دەرزیلەی) |
| تایبەتمەندییەکانی | |
| بارستە مۆڵ | ٢٢٧/١٣١ غم / مۆڵ |
| باری ماددەکە | ڕەق |
| هەستیاری بۆ پیاکێشان | نا هەستیارە |
| هەستیاری بۆ لێخشان | نا هەستیارە |
| چڕی | ١,٦٥٤ غم /سم٣ |



| | |
|---|---|
| خێرای تەقینەوە | ٦،٩٠٠ م/چ |
| پلەی توانەوە | ٨٠،٣٥ °س |
| پلەی کوڵان | ٢٩٥ °س |
| فشاری بون بە هەڵم | ٠,٠٥٧ باسکالَ (٨١ °س) |
| توانای توانەوە | باشە بە کارتێکردنی، ئەسیتۆن، بەنزین. باشنییە لە ئاودا. |
| سەرچاوەی پاراستن | |
| هێمای مەترسیداری بۆ بوونی ئەم ماددەیە | |



| |
|---|
| سیستەمی جیهانی بۆ یەکەکان بە کارهاتووە لێرەدا، سەرجەم زانیارییەکان لێرەدا پێوانەییە لە ژێر فشار و پلەی گەرمای پێوانەیدایە |

تی ئێن تی TNT یان ترۆتیل، ماددەیەکی کیمیاوییە بە ناوی زانستی ترای-نیترۆ-تۆلیۆیین ناسراوە، ماددەیەکی تەقەمەنییە بۆ خۆی کە وەك بەشێك لە تێکەڵەیەکی تەقەمەنی تر بەکاردێت. شێوگی کیمیاوی CH3(2NO)2H6C٣ بە پێچەوانەی نترۆگلیسرین (Nitroglycerin)ە، کە بە هۆی کارتێکردنی پیاکێشانەوە ناتەقێتەوە، واتا بۆ تەقاندنەوەی پێویستی بە تەقێنەرەوەیەك هەیە (Detonator). ئاو هەڵنامژێت، بە پێچەوانەی داینامیتەوە Dynamite، توانای هەڵگرتنی هەیە بۆ ماوەیەکی درێژ بەبێ ئەوەی کارای خۆی لە دەست بدات.

وەك یەکەیەك بۆ پێوانەی وزە بەکاردێت. بۆ نموونە وزەی بۆمبایەکی ناوکی پێوانە بە تەقاندنەوەی بڕێکی دیاریکراو لە تی ئێن تی پێوانە دەکرێت. بۆ نموونە بۆمبایەکی ناوکی بە هێزی ١٠ کیلۆ تەن (kiloton) هێزەکەی یەکسانە بە تەقاندنەوەی ١٠ هەزار تەن لە تی ئێن تی.

**ماددەکە ناسراوە بەوەی کە ژەهرە و توانای هەڵمژینی هەیە لە ڕێگەی پێستەوە.**

مێژووی تی ئێن تی: ساڵی ١٨٦٣ بۆ یەکەم جار تی ئێن تی دروستکرا لە سەر دەستی کیمیاگەری ئەڵمانی جۆزیف ویلبراند، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی بڵاوی نەکردەوە لەبەر ئەوەی ڕێگەی تەقاندنەوەی گران بوو لەو کاتەدا ناچالاك دەرکەوت لە یەکەم وێنەیدا، سوپای ئەڵمانی لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا بەکاریهێنا لە دژی کەشتییە بەریتانییەکان.

## نترۆگلیسرین (Nitroglycerin)

نترۆگلیسرین ماددەیەکی شلی زۆر خێرای تەقەمەنییە، کە بنەمای گیراوەی داینامیتە کە زانای ئیتاڵی ئاسکانیۆ سۆبیرۆ Ascanio Sobrero توانی پێی بگات بە دلۆپاندنی گلیسرین لە تێکەڵەیەکی دووترشی چڕدا کە ترشی کبریتیك و ترشی نیتریك بوو، بەڵام بەکارهێنانی دیاریکراو بوو لەبەر ئەوەی تەنها بە ئاڵۆویرکردنی ناوشیارانە دەتەقییەوە. تا چەند ساڵ پاشتر ئەلفرێد نۆبڵ ڕێگەیەکی بۆ ئەمان دۆزییەوە، کە لەگەڵ خۆڵ تێکەڵی کرد، هەروەها لەگەڵ لۆکە و لەگەڵ نترۆ سلیلۆز و لەگەڵ هەموو ماددەیەك تێکەڵاوی کرد، بۆ کەمکردنەوەی هەستیاری. تا گەیشتە شێوەی داینامیت، داینامیتی جەلاتینی و ڕەقی دەستکەوت. داینامیت چەند خراپی هەیە لەوانە هێزەکەی کەم دەکات لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا، بەڵام لە ڕۆژەکانی یەکەمی دروستکردنیدا بەهێزترە.

نترۆگلیسرین: ماددەیەکە کە زۆر زوو کارلێك دەکات پێکهاتووە لە $(HNO_3+H_2SO_4)$+ گلیسرینی پوخت، توندی تەقینەوەی ١٧٥١ کیلۆ جول، پێکهاتەی کیمیاوی 9O3N5H3C.

داینامیت: ماددەیەکی خێرایە بۆ تەقینەوە، داهێنەرەکەی زانای سویدی ئەلفرێد نۆبڵە، کە بۆ هەڵکەندنی کانەکان بەکاری هێنا، بەڵام لە کەمکردنەوە و یارمەتیدانی کاری کرێکارانەوە برا بۆ خواستی جەنگ. داینامیت لە ئێستادا لە جۆرە زۆر چاو بۆ گێڕدراوەکانە بە مەبەستی تازەگەری جۆرا و جۆری چەك کە لە جەنگەکاندا بەکاردێت.



# چالاکیە پیشەسازییەکانی ئەلفرێد نۆبڵ

# Alfred Nobel's Industrial Activities

## کۆمپانیای نۆبڵ داینامیت The Nobel Dynamite Companies

**پێشەکی:**

ئەو تۆزە ڕەشەی کە دەیان ساڵە لە بەردەستدایە دەتەقێنرێتەوە بۆ مەبەستی شارستانی و سەربازیش، داهێنانی ئەلفرێد نۆبڵە، بەوەی کە دەستی گرت بەسەر تەقینەوەی ماددەی نترۆگلیسریندا و وایلێکرد کە بتوانرێت ئەم ماددە تەقەمەنییە بەهێزتربێت، و لە بازاڕی تەقەمەنی شارستانی و سەربازیدا جێگەی بایەخ بێت. داینامیت بە گواستنەوە و تاوتوێکردنی نترۆگلیسرین وەبەرهات. بە گشتی پیشەسازییەکی نوێ و فراوان بوو. کەپشتی بەداهێنانی نۆبڵ بەست لە سەرەتادا و لە ماوەی ١٠ ساڵدا ١٦ کارگەی لە ١٤ وڵاتدا دامەزراند، لەگەڵ نۆبڵدا وەك هەڵگری پشك (سەهم) یان خاوەن یان هاوبەش کەسان و کۆمپانیای تریش هاوبەش بوون لە بنیاتنانیاندا. لە سەرەتادا لەگەڵ کۆمپانیای هاوبەش لە ستۆکهۆڵم کاریکرد. نۆبڵ ساڵانێك پاش ئەوەی کۆمپانیایەکی فراوانی نێودەوڵەتی یەکەمی لە جیهاندا بە ناوی کۆمپانیای داینامیت نۆبڵی ماڵی دامەزراند، کە ئەمە دیاردەیەکی نوێ بوو لە جیهانی بزنزدا. کۆمپانیایەك کە بە فراوانی بووە خاوەنی پشك لە کۆمپانیاکانی تردا لە ژمارەیەك وڵاتدا و دەستی گرت بەسەریاندا و کارە هاوبەشەکانی بەڕێوەبرد.

سوید ١٨٦٤ Sweden: لە ساڵی ١٨٦٤ دا نۆبڵ نترۆگلیسرین ئەکتیبۆلاگیت ئەی بی Nitroglycerin Aktiebolaget AB ی لە سوید دامەزراند. کۆمپانیایەك بوو بەسەرمایەیەکی زۆر کەمەوە کەوتەکار، کە زۆربەی پارەکەی لەلایەن بازرگانێکی ستۆکهۆڵمەوە دابین کرابوو کەلە ٤٩,٦٪ لە پشکەکانی کۆمپانیاکەی دەدرایە. کارگەکە لە ڤینترڤیکن Vinterviken بنیات نرا کە ١٠ کیلۆمەتر لە ناوەندی شاری ستۆکهۆڵمەوە دور بوو.

نەرویژ ١٨٦٥ Norway: لە سەرەتای ساڵی ١٨٦٥ دا نۆبڵ کۆمپانیای دووەمی نترۆگلیسرنی دامەزراند لە وڵاتی نەرویژ.

ئەڵمانیا ١٨٦٥ Germany: بە تەواوی درکی خۆیەوە بۆ بازاڕ و ئەگەرە گەورەکانی ماددەی تەقەمەنی نوێ، نۆبڵ دەستیکرد بە بەرهەمهێنان لە وڵاتانی تردا کرد. لە نیوەی دووەمی ١٨٦٥ دا سویدی بەجێهێشت، نەیتوانی بگەڕێتەوە بۆ ئەو وڵاتە جگە بە سەردان نەبێ. چوو بۆ هامبۆرگ Hamburg لەوێ دەستی کرد بە پیشەسازی نترۆگلیسرین. لە سەرەتای کارەکەوە لە ژێر مەرجە کاتییەکانی دوو بازرگانی سویدیدا بوو. پاش پێدانی مۆڵەت لەلایەن کاربەدەستانەوە لە کرومیل Krümmel، لە دەرەوەی هامبۆرگ کارگەیەکی بنیاتنا. نۆبڵ ٥٧ ٪ ی کۆمپانیا ئەڵمانییەکەی هەبوو.

ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا USA١٨٦٦: لە ساڵی ١٨٦٦ دا نۆبڵ چوو بۆ ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا، ئامانجی سەرەکی بەرگریکردن بوو لە مافە تۆمارکراوەکانی لەوێ. پاش ئەوەی بەسەرکەوتووی ئەم کارەی ئەنجامدا. خۆی ئامادەکرد بۆ پێکهێنانی کۆمپانیای نترۆکلیسرین. لەلای رۆژهەڵاتی رووباری هاکینساك Hackensack لە نیوجیرسی New Jersey بنیاتی کۆمپانیایەکی نا کە ئەمڕۆ دوورنییە لە کۆتایی پردی جۆرج واشنتۆن George Washington. پاش سێ ساڵ کارگەکە روخا بە هۆی تەقینەوەوە لەناو چوو. کۆمپانیاکە لە بەرهەمهێنان وەستا.

فەرەنسا ١٨٧٠ France: لە ساڵی ١٨٦٩ دا نۆبڵ چاوی کەوت بە پاوڵ بارب Paul Barbe لە فەرەنسا. کە ئارەزوویەکی زۆری هەبوو بۆ داینامیت. کە لە لیڤیردۆن Liverdunلە نزیك نانسی Nancy دەژیا. هەردووکیان رازی بوون بە دابینکردنی پارەی داینامیت لە فەرەنسادا. بە وەبەرهێنانی دەوڵەت لە بەرهەمهێنانی تەقەمەنیدا. بەو مەرجانەی کە نۆبڵ دابوونی (هەی بوو). واتا بە نیوەی خێرەکەی رازی بوو. کارگەکە لە کۆتایدا بنیاتنرا لە پاولیلیس Paulilles لەسەر دەریای سپی ناوەڕاست لە پارینیس – ئۆرینتالیس Pyrénées-Orientales.

شانشینی یەکگرتوو (بەریتانیا) ١٨٧١ United Kingdom: شەریکە ئەڵمانییەکەی نۆبڵ، پێی باش بوو کە کۆمپانیا ئەڵمانییەکە فراوان بکرێت بۆ کۆمپانیایەکی بەرهەمهێنی گەورە، بەڵام نۆبڵ پێشینەیەکی تری هەبوو. لە بەهاری ساڵی١٨٦٨ دا نۆبڵ چوو بۆ بەریتانیا لەگەڵ خۆی جانتایەك داینامیتی هەڵگرتبوو. بە بەریتانیادا گەڕا و گەشتی کرد، خۆپیشاندان



لە دژی بەرێخرا لە شوێنی جۆراوجۆر لە دژی ئەو بەرهەمە تازەیەی (داینامیت). گفتوگۆکانی سێ ساڵی خایاند لەم وڵاتەدا کە زۆرترین هۆکار ئەو راستییەبوو کە نۆبڵ و مەرجەکانی لێزانانی (خەبیر)ە ماڵییە سکۆتلەندییەکان Scotland هەیان بوو کە زۆر گران بوو بۆ رێکەوتن. لە ساڵی ١٨٧١ دا کۆمپانیای بریتش داینامیتی سنووردار British Dynamite Company Ltd دامەزرا. بەسەرمایەی ٢٤ هەزار پاوەند. کە بۆ ئەوکاتە کۆمپانیایەکی زۆر بچووك بوو.



ئەو جانتایەی کە نۆبڵ هەمیشە لەگەڵ خۆی دەیبرد بۆ وڵاتان و شوێنەکانی کارکردنی

# جەنگ و ئاشتی لە بیرکردنەوەی ئەلفرێد نۆبڵد

## War and Peace in the Thinking of Alfred Nobel

پاش ئەوەی خواستی نۆبڵ ئاشکرا بوو لە پاش مردنی لە سان ڕیمۆ (San Remo) لە ١٠ی کانوونی یەکەمی ساڵی ١٨٩٦ دا. ئاشکرا بوو کە خەڵاتێکی تایبەتی بۆ ئاشتی داناوە. ئەمە یەکسەر هەرایەکی گەورەی نێودەوڵەتی نایەوە، کە ناوی نۆبڵ گرێدراوە بە تەقینەوە و تەکنیکی سوودمەند بە جەنگەوە. بەڵام بەدڵنیاییەوە نەك لەگەڵ شتی گرێدراو بە ئاشتییەوە. ئەلفرێد نۆبڵ خواستی بوو کە خەڵاتی ئاشتی لەلایەن لیژنەیەکی پێنج کەسییەوە کە پەرلەمانی نەرویژی دیاریدەکات ببەخشرێت. بەو کەسانەی کە زۆرترین یان باشترین کاریان ئەنجامداوە بۆ برایەتی نێوان گەلان یان بۆ هەڵوەشاندنەوە و کەمکردنەوەی سوپای هەمیشەیی یان پاڵپشتی کردنی بۆ کۆنگرەکانی ئاشتی، ئەنجامدابێت. لە نووسراوەکانی ئەلفرێد نۆبڵدا شیکردنەوەی جیاواز بۆ بیرەکانی هەیە. تێوەگلانی لە چیرۆکی خۆشەویستیدا، هەندێك دەڵێن لە لاوێتییەوە خاوەنی بەرژەوەندی بووە لە ئاشتیدا لە هەندێك لە کارەکانیدا، هەندێکی تر دەڵێن تاکاتێکی زۆر دەرەنگ نەهات بۆ پێچەوانەکردنەوەی شتی چارەنووسسازی مرۆڤایەتی. ئەلفرێد نۆبڵ دنیابینییەکی ڕۆشنی هەبوو کە چی دەگوزەرێت لە سیاسەتی نێودەوڵەتیدا لە ماوەی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەمدا. دەستیکرد بە چالاکی پیشەسازی، تاپلەیەکی بەرز داهێنان و چالاکییە







بازرگانییەکانی بەستراوە بوو لەگەڵ مەرجە پێویستەکانی جەنگ و ئاشتیدا، ئەلفرێد وەك لاوێك ئامادەبوو لەگەڵ باوکیدا ئەمانوئێل لەسەر حسابی قەیسەری ڕوسی مینی دەریاییان دروستکرد کە هۆکارێك بوو لە خزمەتی جەنگی قرمدا لە ناوەڕاستی ئەو سەدەیەدا. داهێنانی گرنگی تایبەتی ئەلفرێد دایناميتە. بەو بیرەوە پێشی نەخست کە لە جەنگدا بەکاربێت، نەیشی توانی بەر بەوە بگرێت کە لەو بوارەدا بەکارنەیەت. دایناميت بۆ نموونە لە جەنگی فرانکۆ پروسیدا (Franco-Prussia) بۆ یەکەم جار لەلایەن پرۆسییەکانەوە بەکارهات. پاشتر لەلایەن فەرەنسییەکانەوە بەکارهات. لە ساڵی ١٨٨٠دا گەشەی پێدا و پێشکەشی کرد بە فەرەنسییەکان بە ناوی تۆزی بێ دوکەڵ (smokeless powder)، بەڵام بە هۆی چەند ئاڵۆزییەکەوە لە جیاتی ئەوان هات تا بەئیتاڵیەکانی بفرۆشێت. لە دەیەی کۆتایی ژیانیدا ئەلفرێد نۆبڵ خۆی هات تا بەشداری بکات لە پێشخستن و قۆستنەوەی تەکنەلۆژیا و داهێنانی جیاوازی چەکدا. بۆ نموونە موشەك و تۆپی پێشکەوتوو. لە ناوەڕاستی سوید کە بووبووە ناوەندی ئەم کارەی. بەم کارەشی ڕاستەوخۆ چووە بەشی عیتاد و پێویستییە سەربازییەکانی جەنگەوە، ئەمەی بەتەواوی بۆ دەستەبەر نەکرا تا کۆتایی ژیانی هەروەها لەو کاتەدا وتی کە بەرژەوەندی لە کردەی ئاشتیدایە. بیروڕاکانی لەسەر جەنگ و ئاشتی پیشاندابوو لە ساڵانێکی دوور و درێژدا لەو نامە گۆڕینەوانەی لەگەڵ جەنگاوەری ئاشتی نەمساوی و دانەری ڕۆمانی بەناوبانگی دژی جەنگ بەناوی (چەکەکەت دانێ) (Lay down Your Arms) بیرسا ڤۆن سۆتنەر (Bertha von Suttner)، لە یەکەم یەکتر بینینیاندا لەگەڵ نۆبڵ لە پاریس لە ساڵی ١٨٧٦ دا، کاریگەری لەسەر نۆبڵدانا، لە ساڵی ١٨٩١ دا خاوەندارێتی کارگەی دایناميتی هەڵواسی بۆ بێرسا. وتیشی لەوانەیە کارگەکانم ئاستێك بۆ جەنگ دابنێن بەمزوانە، پاش ئەوەی درکی بەوە کرد ئەمڕۆ دوو فەیلەقی سوپا دەتوانن لە ماوەی چرکەیەکدا یەکتری لەناوبەرن سەرجەم گەلانی شارستانی هەست بە ترس دەکەن لە لەناوچوونی هێزەکانیان. نۆبڵ بۆ ماوەیەکی درێژ نەژیا تا ڕووبەڕووی جەنگی جیهانی یەکەم ببێتەوە تابیبنێت چەندە بیروبۆچوونەکانی هەڵە بووە. لە ڕێگەی پەیوەندی کردنی بە بێرساوە کاریگەری لەسەر بیری نۆبڵ دانا، لانی کەم لەیەك خاڵدا، بێرسا لە هێزێکی بزوێنەری جیهانی دژی جەنگ کە لە ئەوروپا بەرپا ببوو ئەندام بوو. نۆبڵ بووبە ئەندامی رابیتەی ئاشتی نەمساوی، هاوکاری ئاشتی دەکرد بە پارە. هەروەك بۆی (بێرسا) نووسی تەنها پارە پێویست نییە، بەڵکو

بەرنامەیەکی واقعی دەوێت. ئەلفرێد نۆبڵ چاوی لە ئاشتی بوو و سەرنجی ئەم کارەی ئەدا لە ئەوروپادا. لە ٢٧ ی تشرینی دووەمی ١٨٩٥ دا چوارچێوەی خەڵاتێکی دارشت (بۆ هەر کەسێك کە باشترین کارێك بکات بۆ برایەتی نێوان گەلان، یان کەمکردنەوەی سوپا و بەستنی کۆنگرە و پاڵپشتی ئاشتی بکات)، ئەلفرێد نۆبڵ یەکسەر بە بیرسای راگەیاند و خۆشحاڵی خۆی دەربڕی. لە سەدەی نۆزدەدا نۆبڵ کاتێکی زۆری بۆ گەشەپێدانی تەکنەلۆژیای چەك تەرخان کرد. کە واینەدەبینی کە تێوەگلابێت لە جەنگەوە، چونکە زانایان بەرپرس نین لەوەی کە چۆن بەرهەمەکانیان بەکاردەهێنرێت. هەموو زانایەك خۆی بەبێلایەن دەزانێت کە دەتوانرێ کارەکەی بۆ ئامانجی باش یان خراپ بەکاربێت. کە ئەم بیرۆکەیە بەسەر چەکیشدا دەسەپێت، کە نۆبڵ داینامیتی دۆزییەوە مەبەستی دروستکردنی چەك نەبوو، بۆیە خۆی بەبێلایەن دەزانێت.



## پۆلەکانی خەڵاتی نۆبڵ

## Nobel Prize Categories

| پۆل | مەدالیا | تایبەتمەندی |
|---|---|---|
| خەڵاتی نۆبڵی فیزیا |  | ئەکادیمیای پاشایەتی سوید بۆ زانست Royal Swedish Academy of Sciences دەیبەخشێت بە هەر کەسێك کە داهێنان یان دۆزینەوەیەکی گرنگ ئەنجامبدات لە بواری فیزیادا. |
| خەڵاتی نۆبڵی کیمیا |  | ئەکادیمیای پاشایەتی سوید بۆ زانست Royal Swedish Academy of Sciences دەیبەخشێت بە هەر کەسێك کە داهێنان یان دۆزینەوەیەکی گرنگ ئەنجامبدات لە بواری کیمیادا. |
| خەڵاتی نۆبڵی نۆژداری و فیسیۆلۆژی |  | دەبەخشرێت بە هەر کەسێك کە دۆزینەوەیەکی زۆر گرنگ ئەنجامبدات لە بواری نوژداری و فیسۆلۆژیدا کە پەیمانگای کارۆلینسکا Karolinska Institutet دەی بەخشێت. |
| خەڵاتی نۆبڵی وێژە |  | ئەکادیمیای سویدی Swedish Academy دەیبەخشێت بە هەر کەسێك کە لە بواری وێژەدا دیارترین کار ئەنجامبدات. |
| خەڵاتی نۆبڵی ئاشتی |  | لەلایەن کۆمیتەی نۆبڵی نەرویژەوە Norwegian Nobel Committee دەبەخشرێت بە هەر کەسێك کە کارێکی لە پێناو برایەتی لە نێوان گەلاندا ئەنجامدابێت، یان هەوڵیدابێت بۆ کەمکردنەوە و هەڵوەشاندنەوەی سوپاکان و هەوڵدان بۆ بەئەنجام گەیاندنی کۆنگرەی ئاشتی. |
| خەڵاتی نۆبڵی ئابووری |  | ئەکادیمیای پاشایەتی سوید بۆ زانست Royal Swedish Academy of Sciences دەیبەخشێت بە هەر کەسێك کە داهێنانێکی دیاری بە ئەنجام گەیاندبێت لە بواری ئابووریدا، کە خەڵاتی بانکی ناوەندی سویدە (Sveriges Riksbank). |

## مەدالیای خەڵاتەکە



سندوقی مەدالیاکە

Medal of Prize

دیوی پێشەوەی مەدالیای بەخشینی خەڵاتی نۆبڵ (فیزیا، کیمیا، وێژە، نوژداری) نەخشاوە، هەمان پیشاندانیان هەیە، کە وێنەی سەری ئەلفرێد نۆبڵە، لەگەڵ ساڵانی لە دایکبوون و مردنی بە زمانی لاتینی ( NAT-MDCCC XXXIII OB-MDCCC XCVI)، هەمان وێنەش لەسەر مەدالیای ئاشتی و ئابووری هەیە بەڵام بە کەمێك جیاوازییەوە.

هەریەك لە مەدالیاکان کێشی (٢٠٠ گ) گرامە، و تیرەکەی (٦٦ مم) ملیمەترە، و لە ئاڵتونی عەیاری (٢٣) دروستکراوە، ئاماژەکانی سەر مەدالیاکە بە پێی ئەو دامەزراوەیەی کە دەیبەخشێت دەگۆڕێت، لە ساڵی ١٩٨٠وە مەدالیاکانی سوید (ئەو مەدالیایانەی کە وڵاتی سوید دەیبەخشێت، واتە جگە لە مەدالیای خەڵاتی ئاشتی، کە وڵاتی نەرویژ دەیبەخشێت) مەدالیاکانی خەڵاتی نۆبڵ هەمان دارشتنیان هەیە (تصميم). لە ساڵی ١٩٠٢ وەوە جگە لە مەدالیای ئابووری، مەدالیای نۆبڵ (ئەوانەی لە سوید دەبەخشرێن جگە لە ئابووری) لە کاتی گونجاودا تەواونەبوو بۆ رێورەسمی ساڵی ١٩٠١، بۆیە مەدالیای کاتی بەخشرا، لە ساڵانی ١٩٠١-١٩٠٢ ئریك لیندبیرگ (Erik Lindberg) کە لە پاریس دەژیا، کەوتبووە ژێر کاریگەری نەقاشەکانی مەدالیای فەرەنسی مۆدێرنەوە لەوکاتەدا، رۆی چاپلین Roty, Chaplain، تیست Tasset، ڤێرنون Vernon، کە دروستکەری ژمارەیەك مەدالیایە. هۆی دواکەوتنی مەدالیاکان دەگەرێتەوە بۆ ئەو سومبولانەی کە دەبوایە لەسەر رووی مەدالیاکان هەبوایە، کە دەبوایە لەلایەن سەرجەم ئەو دامەزراوانەی کە خەڵاتەکان دەبەخشن پەسەندبکرایە بەبێ ناکۆکی، پاش راگۆڕینەوەیەکی درێژ بەنامە، ئریك لیندبیرگ بڕیاری گەڕانەوەیدا بۆ ستۆکهۆڵم لە تشرینی دووەمی ١٩٠١دا تا بیروڕاکانی خۆی پێشکەش بکات کە سەرجەمیان پەسەندبوون .



## مەدالیای خەڵاتی زانستی ئابووری سیرجیس ریکسبانك لە یادی ئەلفرێد نۆبڵدا

The Medal for The Sveriges Riksbank Prize in Economic Sciences in Memory of Alfred Nobel



دیوی پێشەوەی مەدالیای ئابووری

ئەستێرە و تاجەکە دروشمی ئەکادیمیای پاشایەتی سوید بۆ زانست کە لە ساڵی ١٨١٥ دا دامەزراوە، لێواری مەدالیاکە نەخشاوە بە وشەکانی (Kungliga Vetenskaps Akademien) واتا ئەکادیمیای پاشایەتی سوید بۆ زانست. دیوەکەی دیکە وێنەی بەشی سەرەوەی لەشی ئەلفرێد نۆبڵ پیشاندەدات، لێوارەکانی بە وشەی ( Sveriges Riksbank till Alfred Nobels Minne 1968) واتا بە ئینگلیزی ( The Sveriges Riksbank, in memory of Alfred Nobel, 1968) سڤیلایجس ریکسبانك (بانکی ناوەندی سوید) لە یادی ئەلفرێد نۆبڵ ١٩٦٨ نەخشاوە. ئەم خەڵاتەش بە گوێرەی مەرجەکانی پێنج خەڵاتەکەی تر دەبەخشرێت، ناوی براوەی خەڵاتەکەش لەسەر لێوارەکەی نەخشاوە، ئەم مەدالیایە لەلایەن گۆنڤۆر سڤینسۆن لۆندکڤت (Gunvor Svensson Lundqvist) نەخشەی کێشراوە.






دیوی پشتەوەی مەدالیای ئابووری

## مەدالیای خەڵاتی نۆبڵ بۆ ئاشتی

## The Nobel Prize Medal for Peace



دیوی پێشەوەی مەدالیای ئاشتی



دیوی پێشەوەی مەدالیای ئاشتی، بەشی سەرەوەی لەشی ئەلفرێد نۆبڵ پیشان ئەدات، و لەسەر لێواری مەدالیاکە ناوی ئەلفرێد نۆبڵ نووسراوە لەگەڵ ساڵانی لەدایکبوون و مردنی بە زمانی لاتینی ALFR. NOBEL-MDCCC XXXIII OB-MDCCC XCVI . دیوەکەی دیکە وێنەی سێ پیاوە کە باوەشیان بەیەکدا کردووە لە شێوەی کۆمەڵەیەکی برایەتیدا، لە سەر لێوارەکەی بۆ ئاشتی و برایەتی Pro pace et fraternitate نەخشاوە لەگەڵ ناوی براوەی خەڵاتەکەش لەسەری نەخشاوە. ئەم مەدالیایە لەلایەن (گۆستاڤ ڤیجیلاند) Gustav Vigeland نەخشەی کێشراوە.






دیوی پشتەوەی مەدالیای ئاشتی

## مەدالیای خەڵاتی نۆبڵ بۆ وێژە

The Nobel Prize Medal for Literature



دیوی پێشەوەی مەدالیای فیزیا و کیمیا و وێژە و نوژداری

بەهەمان شێوە ئەم دیوەی مەدالیاکانی (فیزیا و کیمیا و وێژە و نوژداری) کە هەموویان ئەم دیوەیان هەمان پیشاندانیان هەیە. بەشی سەرەوەی لەشی ئەلفرێد نۆبڵ پیشان ئەدات، لەگەڵ ناوی ئەلفرێد نۆبڵ و ساڵانی لە دایکبوون و مردنی بە زمانی لاتینی هەروەك مەدالیاکانی تر.






دیوی پشتەوەی مەدالیای وێژە



وێنەی پیاوێکی لاو دەنوێنێت کە لە ژێر دارێکدا دانیشتووە، خوداوەندێك دەنووسێت و گۆرانی ئیلهام دەڵێت، لە سەر لێوارەکەی ( Inventas vitam juvat excoluisse per artes) ئەو کەسانەی هەلومەرجی ژیان لە سەر زەوی باش دەکەن بە دۆزینەوە نوێیەکانیان، ناوی براوەکە لەسەر لێوارەکەی نەخشاوە، ئەم مەدالیایە لەلایەن ئریك لیندبیرگ (Erik Lindberg) نەخشەی کێشراوە.

## مەدالیای خەڵاتی نۆبڵ بۆ فیسیۆلۆژیا یان نوژداری

The Nobel Prize Medal for Physiology or Medicine






دیوی پشتەوەی مەدالیای نوژداری

مەدالیای پەیمانگای کارۆلینسکایە، کە وێنەی دکتۆرێکی عەبقەرییە کە کتێبێکی کراوەی هەڵگرتووە لە باوەشیا، ئاو کۆدەکاتەوە بۆ ئەوەی تینوێتی کچێکی نەخۆشی پێبشکێنێت، لە سەر لێوارەکەی (Inventas vitam juvat excoluisse per artes)

ئەو کەسانەی هەلومەرجی ژیان لە سەر زەوی باش دەکەن بە دۆزینەوە نوێیەکانیان، ناوی براوەکە لەسەر لێوارەکەی نەخشاوە، ئەم مەدالیایە لەلایەن ئریك لیندبیرگ ( Erik Lindberg) نەخشەی کێشراوە.

## مەدالیای خەڵاتی نۆبڵ بۆ فیزیا و کیمیا

## The Nobel Prize Medal for Physics and Chemistry






دیوی پشتەوەی مەدالیای فیزیا و کیمیا

مەدالیای ئەکادیمیای پاشایەتی سوید بۆ زانستە، کە خوداوەندێك کەلە ئیسس(Isis) دەچێت لە هەورەوە دەرکەوتووە لە باڵیدا شاخی پیتاندنی هەڵگرتووە ئەو روبەندەی دەموچاوی داپۆشیوە سارده و لەلایەن عەبقەری زانستەوە لادراوە، لە سەر لێوارەکەی (Inventas vitam juvat excoluisse per artes) ئەو کەسانەی هەلومەرجی ژیان لە سەر زەوی باش دەکەن بە دۆزینەوە نوێیەکانیان، ناوی براوەکە لەسەر لێوارەکەی نەخشاوە، ئەم مەدالیایە



لەلایەن ئریك لیندبیرگ (Erik Lindberg) نەخشەی کێشراوە. مەدالیای فیزیا و کیمیا و نۆژداری و وێژە لەلایەن نەحاتی سویدی ئریك لیندبیرگ (Erik Lindberg) وە نەخشێنراوە، مەدالیای ئاشتی لەلایەن نەحاتی نەرویژی گۆستاڤ ڤیجیلاند (Gustav Vigeland) نەخشەی کێشراوە، مەدالیای ئابووری لەلایەن نەحاتی سویدی گۆنڤۆر سڤینسۆن لۆندکڤت (Gunvor Svensson Lundqvist) نەخشەی کێشراوە.

## دبلۆمی خەڵاتی نۆبڵ

## The Nobel Prize Diplomas

دامەزراوەکە ئاهەنگی رۆژی نۆبڵ لە ١٠ ی کانوونی یەکەمی هەموو ساڵێکدا لە یادی کۆچی دوای نۆبڵدا سازدەکات. لە ئاهەنگەکەدا خەڵات دەبەخشرێتە براوەکانی خەڵاتەکانی فیزیا و کیمیا و نۆژداری و وێژە و ئابووری لە ستۆکهۆڵم لەم ئاهەنگەدا شای سوید چەکێکی ماڵی کە بڕی ١٠ ملیۆن کرۆنی سویدییە بۆ هەر خەڵاتێك، مەدالیا و دبلۆمێکی رێزلێنان دەبەخشێت، براوەکان خەڵاتی نۆبڵی ئاشتی، لە هەمان رۆژدا لە لە هۆڵی شاری ئۆسلۆ لەلایەن سەرۆکی لیژنەی نۆبڵی نەرویژییەوە بە ئامادەبوونی شای ئەو وڵاتە رێکدەخرێت و دەبەخشرێت. خەڵاتەکان لەلایەن ئەو دامەزراوانەوە کە بڕیاری دروستکردن (کێشان)ی دبلۆمەکان دەدەن دەبەخشرێت، ئەکادیمیای پاشایەتی سوید بۆ زانستەکان لێپرسراوە لە دبلۆمەکانی فیزیا و کیمیا، لە ساڵی ١٩٦٩ شەوە دبلۆمی ئابووری. پەیمانگای کارۆلینسکا لێپرسراوە لە دبلۆمی نۆژداری، ئەکادیمیای سوید لێپرسراوە لە دبلۆمی وێژە، دەستەی نۆبڵی نەرویژی لێپرسراوە لە دبلۆمی ئاشتی. لە ئێستاشدا شێوەی هەموو




بەرگی دبلۆمەکە

دبلۆمەکان وەك یەکن، کە پێشتر لە سەرەتادا وانەبوو. لەوکاتەوەی دەستە جیاوازەکان بڕیاریاندا دیزاینێکی هونەری بۆ دبلۆمەکان بکێشرێت لەسەر ئارەزوو ماددەی بەکارهاتوو بەپێی ئارەزوو، کۆمپانیای بەرگ تێگری ریفسۆم Refsum bookbinding firm لێپرسراوی رێخستن و بەرگ تێگرتنی دبلۆمەکان بوو تا ساڵی ١٩٨٦ تاکاتێك کۆمپانیای کجیلّ- رۆجیر جۆسیفسۆن Josefson جێگەی گرتەوە. دیزاینی هونەری دبلۆمەکان جیاوازە بەدرێژایی ساڵەک م هەموویان پەیوەست بوون بە هەمان شکڵەوە کە زمانەکانی سویدی و نەرو دا بەزۆری سویدی هەمان دەق لەخۆدەگرێت. ناوهێنانی کەسەبراوەکە، ک ردراوە بە پێدانی خەڵاتەکە سەرباری هۆکاری بەخشینی خەڵاتەکە بەوکە رازاوەتەوە بە گوڵ و باڵندە و زەغرەفە و بەکاری هونەری تر. ئیمڕۆ هەر دبلۆمێکی نۆبڵ کارێکی هونەری دەگمەنە، کە لەسەر پارچەیەك چەرم دروست دەکرێت، بە گشتی هەمان شێوازی نووسینی سەدەکانی ناوەڕاست بەکاردێت. تجلید دەکرێت (بەرگی تێدەگیرێت) بەچەرمی دروستکراو بۆ دبلۆمی فیزیا رەنگی شین، بۆ کیمیا و نۆژداری سوور، بۆ ئابوری قاوەیی، بۆ وێژە هونەرمەند خۆی هەڵیدەبژێرێت. خۆشنووسەکان نەخشی یەك پیتی رەنگ ئاڵتونی بۆ هەر براوەیەك لەسەر رووی دەرەوەی دبلۆمەکە دەنەخشێنن، دبلۆمەکە لە سندووقێك کە لە وەرەقەی بەهێزی چنراو پێکهاتووە، ناوپۆشکراوە لە ناو پێستی بەراز و پێستی خۆشکراودا بە قەبارەی ٢٣ x 35 سم.دادەنێن.





| | | | | |
|---|---|---|---|---|
|  |  |  |  |  |
| | | | | |
| نۆژداری | نۆژداری | کیمیا | فیزیا | فیزیا |
| دبلۆمی خەڵاتی نۆبڵ ٢٠٠٦ The Nobel Prize Diplomas of 2006 |  |  |  |  |
| | | | | |
| | ئابوری | ئاشتی | ئاشتی | وێژە |





# بڕی خەڵاتەکە بە کرۆنی سویدی (ئێس ئی کەی)

## The Prize Amount in Swedish kronor (SEK)

ساڵێك بەرلەوەی بمرێت، ئەلفرێد نۆبڵ لە ٢٧ ی تشرینی دووەمی ١٨٩٥ دا هەندێك لە ئامانجەکانی ژیانی نووسی، خواستبووی کە سەرجەم دامەزراوەکانی و سامانەکەی کە بڕی ٣١ ملیۆن کرۆنی سویدی بوو، کە ئەمڕۆ دەکاتە بڕی ١,٥٠٠ ملیۆن، وەبەربهێنرێت لە شێوەی بۆندی ماڵی پارێزراودا و بکرێتە سندووقێك. دابەشبکرێت لە شێوەی خەڵاتدا ساڵانە، بدرێت بەو کەسانەی کە ساڵی پێشوو زۆرترین سوودیان بە بەشەرییەت گەیاندووە. بڕی خەڵاتی نۆبڵ بۆ ساڵی ٢٠٠٦ نزیکەی ١٠ ملیۆن کرۆنی سویدی بوو بۆ هەر بەشێکی خەڵاتەکە. لێرەدا بڕی ماڵی خەڵاتەکە لە ساڵی ١٩٠١ تا ساڵی ٢٠٠٧ لە شێوەی خشتەیەکدا دەخەینەڕوو لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی ئەم بوارە.






| بڕی ماڵی بە کرۆن | تێبینی | ساڵ |
|---|---|---|
| ١٥٠,٧٨٢ | | ١٩٠١ |
| ١٤١,٨٤٧ | | ١٩٠٢ |
| ١٤١,٣٥٨ | | ١٩٠٣ |
| ١٤٠,٨٥٩ | | ١٩٠٤ |
| ١٣٨,٠٨٩ | | ١٩٠٥ |
| ١٣٨,٥٣٦ | | ١٩٠٦ |
| ١٣٨,٧٩٦ | | ١٩٠٧ |
| ١٣٩,٨٠٠ | | ١٩٠٨ |
| ١٣٩,٨٠٠ | | ١٩٠٩ |
| ١٤٠,٧٠٣ | | ١٩١٠ |
| ١٤٠,٦٩٥ | | ١٩١١ |
| ١٤٠,٤٧٦ | | ١٩١٢ |
| ١٤٣,٠١٠ | | ١٩١٣ |
| ١٤٦,٩٠٠ | | ١٩١٤ |
| ١٤٩,٢٢٣ | | ١٩١٥ |
| ١٣١,٧٩٣ | | ١٩١٦ |
| ١٣٣,٨٢٣ | | ١٩١٧ |
| ١٣٨,١٩٨ | | ١٩١٨ |
| ١٣٣,١٢٧ | | ١٩١٩ |
| ١٣٤,١٠٠ | | ١٩٢٠ |
| ١٢١,٥٧٣ | | ١٩٢١ |
| ١٢٢,٤٨٣ | | ١٩٢٢ |
| ١١٤,٩٣٥ | بڕی ماڵی بۆ خەڵاتەکە، کەمترین بڕ | ١٩٢٣ |
| ١١٦,٧١٩ | | ١٩٢٤ |
| ١١٨,١٦٥ | | ١٩٢٥ |

| | | |
|---|---|---|
| ١٩٢٦ | | ١١٦,٩٦٠ |
| ١٩٢٧ | | ١٢٦,٥٠١ |
| ١٩٢٨ | | ١٥٦,٩٣٩ |
| ١٩٢٩ | | ١٧٢,٧٦٠ |
| ١٩٣٠ | | ١٧٢,٩٤٧ |
| ١٩٣١ | | ١٧٣,٢٠٦ |
| ١٩٣٢ | | ١٧١,٧٥٣ |
| ١٩٣٣ | | ١٧٠,٣٣٢ |
| ١٩٣٤ | | ١٦٢,٦٠٨ |
| ١٩٣٥ | | ١٥٩,٩١٧ |
| ١٩٣٦ | | ١٥٩,٨٥٠ |
| ١٩٣٧ | | ١٥٨,٤٦٣ |
| ١٩٣٨ | | ١٥٥,٠٠٧ |
| ١٩٣٩ | | ١٤٨,٨٢٢ |
| ١٩٤٠ | | ١٣٦,٥٧٠ |
| ١٩٤١ | | ١٣١,٤٩٦ |
| ١٩٤٢ | | ١٣١,٨١٩ |
| ١٩٤٣ | | ١٢٣,٦٩١ |
| ١٩٤٤ | | ١٢١,٨٤١ |
| ١٩٤٥ | | ١٢١,٣٣٣ |
| ١٩٤٦ | دامەزراوەکە لە باج بەخشرا | ١٢١,٥٢٤ |
| ١٩٤٧ | | ١٤٦,١١٥ |
| ١٩٤٨ | | ١٥٩,٧٧٣ |
| ١٩٤٩ | | ١٥٦,٢٩٠ |
| ١٩٥٠ | | ١٦٤,٣٠٤ |
| ١٩٥١ | | ١٦٧,٦١٢ |



| | | |
|---|---|---|
| ١٩٥٢ | | ١٧١,١٣٥ |
| ١٩٥٣ | یاسای دامەزراوەکە بۆ وەبەرهێنان گۆڕا | ١٧٥,٢٩٣ |
| ١٩٥٤ | | ١٨١,٦٤٧ |
| ١٩٥٥ | | ١٩٠,٢١٤ |
| ١٩٥٦ | | ٢٠٠,١٢٣ |
| ١٩٥٧ | | ٢٠٨,٦٢٩ |
| ١٩٥٨ | | ٢١٤,٥٥٩ |
| ١٩٥٩ | | ٢٢٠,٦٧٨ |
| ١٩٦٠ | | ٢٢٥,٩٨٧ |
| ١٩٦١ | | ٢٥٠,٢٣٣ |
| ١٩٦٢ | | ٢٥٧,٢٢٠ |
| ١٩٦٣ | | ٢٦٥,٠٠٠ |
| ١٩٦٤ | | ٢٧٣,٠٠٠ |
| ١٩٦٥ | | ٢٨٢,٠٠٠ |
| ١٩٦٦ | | ٣٠٠,٠٠٠ |
| ١٩٦٧ | | ٣٢٠,٠٠٠ |
| ١٩٦٨ | | ٣٥٠,٠٠٠ |
| ١٩٦٩ | خەڵاتی زانستی ئابووری زیادی کرد | ٣٧٥,٠٠٠ |
| ١٩٧٠ | | ٤٠٠,٠٠٠ |
| ١٩٧١ | | ٤٥٠,٠٠٠ |
| ١٩٧٢ | | ٤٨٠,٠٠٠ |
| ١٩٧٣ | | ٥١٠,٠٠٠ |
| ١٩٧٤ | | ٥٥٠,٠٠٠ |
| ١٩٧٥ | | ٦٣٠,٠٠٠ |
| ١٩٧٦ | | ٦٨١,٠٠٠ |
| ١٩٧٧ | | ٧٠٠,٠٠٠ |

| | | |
|---|---|---|
| ١٩٧٨ | | ٧٢٥,٠٠٠ |
| ١٩٧٩ | | ٨٠٠,٠٠٠ |
| ١٩٨٠ | | ٨٨٠,٠٠٠ |
| ١٩٨١ | | ١,٠٠٠,٠٠٠ |
| ١٩٨٢ | | ١,١٥٠,٠٠٠ |
| ١٩٨٣ | | ١,٥٠٠,٠٠٠ |
| ١٩٨٤ | | ١,٦٥٠,٠٠٠ |
| ١٩٨٥ | | ١,٨٠٠,٠٠٠ |
| ١٩٨٦ | | ٢,٠٠٠,٠٠٠ |
| ١٩٨٧ | | ٢,١٧٥,٠٠٠ |
| ١٩٨٨ | | ٢,٥٠٠,٠٠٠ |
| ١٩٨٩ | | ٣,٠٠٠,٠٠٠ |
| ١٩٩٠ | | ٤,٠٠٠,٠٠٠ |
| ١٩٩١ | | ٦,٠٠٠,٠٠٠ |
| ١٩٩٢ | | ٦,٥٠٠,٠٠٠ |
| ١٩٩٣ | | ٦,٧٠٠,٠٠٠ |
| ١٩٩٤ | | ٧,٠٠٠,٠٠٠ |
| ١٩٩٥ | | ٧,٢٠٠,٠٠٠ |
| ١٩٩٦ | | ٧,٤٠٠,٠٠٠ |
| ١٩٩٧ | | ٧,٥٠٠,٠٠٠ |
| ١٩٩٨ | | ٧,٦٠٠,٠٠٠ |
| ١٩٩٩ | | ٧,٩٠٠,٠٠٠ |
| ٢٠٠٠ | | ٩,٠٠٠,٠٠٠ |
| ٢٠٠١ | | ١٠,٠٠٠,٠٠٠ |
| ٢٠٠٢ | | ١٠,٠٠٠,٠٠٠ |
| ٢٠٠٣ | | ١٠,٠٠٠,٠٠٠ |



| | | |
|---|---|---|
| ٢٠٠٤ | | ١٠,٠٠٠,٠٠٠ |
| ٢٠٠٥ | | ١٠,٠٠٠,٠٠٠ |
| ٢٠٠٦ | | ١٠,٠٠٠,٠٠٠ |
| ٢٠٠٧ | | ١٠,٠٠٠,٠٠٠ |
| ٢٠٠٨ | | ١٠,٠٠٠,٠٠٠ |

## راستییەکانی پاڵاوتن Nomination Facts

ناوی پاڵێوراوانی خەڵاتی نۆبڵ جگە لەوانەی کە سەردەکەون، ئەوانیتر کە ژمارەیەکی زۆرە، پاڵێوراون بۆ ئەم مەبەستە، تا ماوەی (٥٠) ساڵ بەنهێنی دەمێنێتەوە و ئاشکرا ناکرێت. لە ساڵی ١٩٧٤ دا یاساکانی دەمەزراوەی نۆبڵ گۆڕا، بەوەی ناتوانرێت خەڵاتەکە ببەخشرێت بە کەسێك کە مردبێت، هەروەك ئەوەی کە روویدا لە ساڵی ١٩٩٦ دا. پاش ئاشکراکردنی براوەکانی خەڵاتی نۆبڵ بۆ ئەو ساڵە، ویلیام ڤیکری William Vickrey مرد تەنها چەند رۆژێك پاش ئاشکراکردنی ناوەکەی وەك براوەی خەڵاتی نۆبڵی ئابووری.



بەر لە ساڵی ١٩٧٤ خەڵاتی نۆبڵ دووجار بەخشراوە بەم شێوەیە بە داگ هامارسجۆد Dag Hammarskjöld خەڵاتی نۆبڵی ئاشتی بۆ ساڵی ١٩٦١، ئێریك ئاکسڵ کارڵفێلدت Erik Axel Karlfeldt خەڵاتی نۆبڵی وێژە بۆ ساڵی ١٩٣١.

ئایا ستالین پاڵێوراوە بۆ خەڵاتی نۆبڵی ئاشتی؟

جۆزیف ستالین Joseph Stalin، سکرتێری گشتی پارتی کۆمۆنیستی یەکێتی سۆڤێت، دووجار پالێوراوە بۆ خەلاتی نۆبلی ئاشتی، لە سالانی ١٩٤٥ و ١٩٤٨ دا، بۆ ئەو هەولەی دابووی بۆ کۆتاپێهێنان بە جەنگی جیهانی دووەم.

جین ئادامس Jane Addams،91)) جار پالێوراوە لە نێوان سالانی ١٩١٦ بۆ ١٩٣١ دا. دواجار خەلاتی نۆبلی ئاشتی ١٩٣١ ی پێبەخشرا بە هاوبەشی لەگەل نیکۆلاس مۆرای بۆتلەر Nicholas Murray Butler.

جۆن رالیگ مۆت John Raleigh Mott بە هاوبەشی لەگەل Emily Greene Balch لە یەکەم پالاوتنیاندا خەلاتی نۆبلی ئاشتی ١٩٤٦ یان پێبەخشرا.

تیۆدۆر رۆزڤێلت Theodore Roosevelt، خەلاتی نۆبلی ئاشتی پێبەخشرا بۆ سالی ١٩٠٦، لە یەکەم سالی پالاوتنیدا.

جۆن جێمس ریچارد ماکلیۆد John James Richard Macleod، فریدریك گرانت بانتین Frederick Grant Banting، خەلاتی نۆبلی نوژداریان پێبەخشرا بۆ سالی ١٩٢٣، لە یەکەم سالی پالاوتنیاندا بەسی پالاوتن. بە هۆی دۆزینەوەی ئەنسۆلینەوە.

رۆبەرت کۆچ Robert Koch، 55)) جار لە ماوەی (٤) سالدا پالێوراوە، بەرلەوەی لە سالی ١٩٠٥ دا خەلاتی نۆبلی نوژداری پێببەخشرێت.

ماهاتما گاندی Mahatma Gandhi، سومبولی بەهێزی ناتوندوتیژی لە سەدەی بیستەمدا، خەلاتی نۆبلی ئاشتی پێنەبەخشرا. سەرەرای ئەوەی (١٢) جار پالێورا لە نێوان سالانی ١٩٣٧ بۆ ١٩٤٨ دا .



## لایەنەکانی بەخشینی خەلاتەکە




KUNGL.
VETENSKAPSAKADEMIEN
THE ROYAL SWEDISH ACADEMY OF SCIENCES

## ئەکادیمیای پاشایەتی سوید بۆ زانست

Royal Swedish Academy of Sciences

ئەم ئەکادیمیایە لە ستۆکهۆلمە و دامەزراوەیەکی ناحکومی سەربەخۆیە. ئەندامەکانی سویدین، ئامانجی سەرەکی ئەکادیمیاکە هاندانە بۆ توێژینەوەی زانستی و بەرگری کردن لە ئازادی زانستی. ئەکادیمیاکە لە سالی ١٧٣٩ دا دامەزراوە. پشتی بەستووە بە کۆمەلەی پاشایەتی لەندەن و ئەکادیمیای پاشایەتی بۆ زانست لە پاریس. لە رێگەی پەیوەندییەکانی بەم ئەکادیمیایانەوە و هیتریش. کە یارمەتی ئەکادیمیای پاشایەتی سویدیدا بە مانەوەی پەیوەندی و پەیوەندی نێودەولەتی لە نێوان توێژەرەوانی زانستیدا. دابینکردنی ئامانجەکانی تری هاندانی سویدییەکان، سویدی هێشتەوە لە سەر هەستان بە بە دەستهێنانەکانی و دۆزینەوەکانی لە زانست و پاداشت کردنی ئەو کەسانەی کە گەیشتوون بە دۆزینەوە زانستییەکان، رێگەیەکی تر کە تیایدا ئەکادیمیای سوید ئامانجەکانی بەدەست دەهێنێت. دیاریکردنی براوەکانی سالانەی خەلاتی نۆبل بۆ فیزیا و کیمیا و ئابوورییە.




## پەیمانگای کارۆلینسکا Karolinska Institute

ناوی تەواوی THE ROYAL CAROLINE MEDICO-CHIRURGICAL INSTITUTE ، لە ساڵی ١٨١٠ دا دامەزراوە، گرنگیپێدانی سەرەکی پەیمانگاکە تایبەتە بە توێژینەوە. ناوبانگێکی نێودەوڵەتی لە توێژینەوەی نوژداری ئەندامیدا بە شێوەیەکی تایبەت بەدەست هێناوە. ناوەندی رۆشنبیری پزیشکییە، پەیمانگای کارۆلینسکا مەشق بە یەك لەسەر سێی پزیشکەکانی، پزیشکی ددان، پزیشکی نەفسی، دەکات. کە مەشقی باوەڕپێکراو لە سوید دەبینن، لە ساڵی ١٩٠١ وە پەیمانگاکە بەرپرسیارە لە هەڵبژاردنی ساڵانەی براوەی خەڵاتی نۆبڵ بۆ زانستی فیسیۆلۆژی و نوژداری، هەروەك ئەلفرێد نۆبڵ لە وەسیەتنامەکەیدا دیاریکردبوو.




## ئەکادیمیای سوید Swedish Academy

هەوڵ ئەدات بۆ پارێزگاری و بەرزکردنەوەی زمان و ئەدەبی سویدی، ئەکادیمیاکە خەڵاتی ئەدەبی جۆرا و جۆری هەیە، لە نێویاندا خەڵاتی نۆبڵی ئەدەب، ئەکادیمیاکە لەلایەن شا گۆستافی سێهەمەوە دامەزراوە، لە ٥ی نیسانی ١٧٨٦ دا لە ستۆکهۆڵم. ئامانجی پوختەکردن



و شکۆمەندبوون و گڕوتین دانە بە زمانی سویدی، لەم چالاکیانەیدا زۆر سەرکەوتووە. وەك دەرکردنی فەرهەنگ و رێزمانی زمانی سویدی. بە دەستهێنانەکانی سویدییەکان لە بواری رەوانبێژی و شعردا ئاشنادەکات لە پێشبڕکێیەکی ساڵانەدا، دراوێکی کانزایی ساڵانە دەردەکات بۆ سەرکەوتووە سویدیەکان. سەرەڕای ئەم خەڵاتە ئەکادیمیاکە زیاتر لە ١٠ خەڵاتی ئەدەبی تری هەیە، وەك خەڵاتی زمانی سویدی بۆ رۆشنبیری لە زماندا، خەڵاتی فێرکردنی سویدی بۆ گرنگی پێدانی زمان و ئەدەبی سویدی لە نەوە بچووکەکاندا. لە هەموویان گرنگتر لە خەڵاتەکانی ئەکادیمیاکەدا، خەڵاتی نۆبڵە بۆ وێژە (ئەدەب)، هەروەك داواکرابوو لە لایەن ئەلفرێد نۆبڵەوە لە وەسیەت نامەکەیدا.




## دەستەی نۆبڵی نەرویژی

## Norwegian Nobel Committee

دەستەی نۆبڵی پەرلەمانی نەرویژی، کۆمەڵەیەکە لە پێنج کەس، کە بەرپرسیارن لە دەست نیشانکردنی براوەی ساڵانەی خەڵاتی نۆبڵ بۆ ئاشتی. کە بۆ ماوەی شەش ساڵ دادەنرێن لە دەستەکەدا لە لایەن ستۆرتین Storting پەرلەمانی نەرویژەوە. تا ساڵی ١٩٣٦ ئەندامانی حکوومەتی نەرویژی هەڵدەبژێردران بۆ دەستەی نۆبڵ . لە سەر ناکۆکی خەڵاتی ئاشتی بۆ ساڵی ١٩٣٥، دەستوەردانی حکوومەت لەو بریارەدا کۆتایی پێهات، لە ساڵی ١٩٧٧ دا بە چوارچێوەیەکی فەرمی ئەندامانی حکوومەتی رێیانلێگیرا کە کاربکەن لە دەستەی خەڵاتی نۆبڵدا. ناوی گروپەکەش بە فەرمی گۆڕا بۆ دەستەی نۆبڵی نەرویژی لە هەمان ساڵدا.

# پاڵاوتن بۆ خەڵاتی نۆبڵ

## Nomination for the Nobel Prize

چۆن دەتوانم خۆم یان کەسێك بپاڵێوم؟ هیچ کەسێك ناتوانێت خۆی بپاڵێوێت. هەلەکانی پاڵاوتن لە نێوان دامەزراوەکانی بەخشینی خەڵاتەکەدا جیاوازە، ئەو کەس و دامەزراوانەی ئەم مافەیان هەیە ئەمانەن.



پاڵاوتن بۆ خەڵاتی نۆبڵ تەنها بە بانگهێشنامە ئەنجام ئەدرێت، دەستەی نۆبڵ نامەی نهێنی دەنێرن بۆ کەسانێك کە گونجاون بۆ پاڵاوتنی خەڵك. ناوی پاڵێوراوان و زانیاری تر دەربارەی پاڵاوتنەکە ناتوانرێت ئاشکرا بکرێت تا ٥٠ ساڵ دواتر جگە لەو کەسانەی کە سەردەکەون لەم پاڵاوتنەدا.

پاڵاوتنەکە بەپێی ئەو یاسایانەی دەستەی نۆبڵ کە هەر دامەزراوەیەك کە بەرپرسیارە لە بەخشینی خەڵاتەکە بۆ خۆی ژمارەیەك رێگا دەگرێتەبەر بۆ ئەم مەبەستە، وەك لە خوارەوە نیشاندراوە. تەنها ئەو کەس و لایەن و دامەزراوانەی کە دیاریکراون مافی ئەوەیان هەیە کەسانێك پێشنیار بکەن بۆ پاڵاوتن بۆ خەڵاتی نۆبڵ.



# چۆنێتی پاڵاوتن بۆ خەڵاتی نۆبڵ لەلایەن دامەزراوە تایبەتمەندەکانی بەرپرس لە دیاریکردنی براوەکانی خەڵاتەکەوە

## پاڵاوتنی گونجاو بۆ خەڵاتی نۆبڵی فیزیا

## Qualified Nominators – The Nobel Prize inPhysics

| | |
|---|---|
| ١- | ئەندامانی سویدی و بێگانەی ئەکادیمیای پاشایەتی سوید بۆ زانست. |
| ٢- | ئەندامانی دەستەی نۆبڵی فیزیا. |
| ٣- | براوەکانی خەڵاتی نۆبڵی فیزیای ساڵانی پێشوو. |
| ٤- | مامۆستا و مامۆستای یاریدەدەرە هەمیشەیەکانی زانکۆکان و پەیمانگا تەکنەلۆژییەکانی سوید و دانیمارك و فنلاند و ئایسلاند و نەرویج و پەیمانگای کارۆلینسکا لە ستۆکهۆڵم. |
| ٥- | هەڵمەتێکی نامەناردن لە کەمتر لە شەش زانکۆ و کۆلێژی زانکۆ کە ئەکادیمیای زانست دیاریاندەکات، لەگەڵ تێبینی کردنی گرنتی دابەشکردنێکی گونجاو بەسەر وڵاتانی جیاوازدا، و سەنگیان لە فێرکاریدا. |
| ٦- | زانایانی تری ئەکادیمیاکە کە خانەنشین بوون کە دامەزراوەکە بەپێچەوانەوە بە گونجاویان دەزانێت بۆ لێکنزیك بوونەوە. |

# پاڵاوتنی گونجاو بۆ خەڵاتی نۆبڵی کیمیا

## Qualified Nominators – The Nobel Prize in Chemistry

| | |
|---|---|
| ١- | ئەندامانی سویدی و بیّگانەی ئەکادیمیای پاشایەتی سوید بۆ زانست. |
| ٢- | ئەندامانی دەستەی نۆبڵی کیمیا. |
| ٣- | براوەکانی خەڵاتی نۆبڵی کیمیای ساڵانی پێشوو. |
| ٤- | مامۆستا و مامۆستای یاریدەدەرە هەمیشەیەکانی زانکۆکان و پەیمانگا تەکنەلۆژییەکانی سوید و دانیمارك و فنلاند و ئایسلاند و نەرویژ و پەیمانگای کارۆلینسکا لە ستۆکهۆڵم. |
| ٥- | هەڵمەتێکی نامەناردن لە کەمتر لە شەش زانکۆ و کۆلێژی زانکۆ کە ئەکادیمیای زانست دیاریاندەکات، لەگەڵ تێبینی کردنی گرنتی دابەشکردنێکی گونجاو بەسەر وڵاتانی جیاوازدا، و سەنگیان لە فێرکاریدا. |
| ٦- | زانایانی تری ئەکادیمیاکە کە خانەنشین بوون کە دامەزراوەکە بەپێچەوانەوە بە گونجاویان دەزانێت بۆ لێکنزیك بوونەوە. |

# پاڵاوتنی گونجاو بۆ خەڵاتی نۆبڵی نۆژداری

## Qualified Nominators – The Nobel Prize in Physiology or Medicine

| | |
|---|---|
| ١- | ئەندامانی دەستەی نۆبڵ لە پەیمانگای کارۆلینسکا لە ستۆکهۆڵم. |
| ٢- | ئەندامانی سویدی و بیّگانە لە بەشی نۆژداری لە ئەکادیمیای پاشایەتی سوید بۆ زانست. |
| ٣- | براوەکانی خەڵاتی نۆبڵی نۆژداری ساڵانی پێشوو. |



| | |
|---|---|
| ٤- | ئەندامانی دەستەی نۆبڵ لە نۆژداریدا کە برگەی یەك نایان گرێتەوە. |
| ٥- | هەڵمەتێك بۆ پۆستەکانی دامەزراوەکان وەك پرۆفیسۆران لە کۆلێژەکانی نۆژداری لە سوید، و هەڵمەتێکی هاوشێوە لە کۆلێژەکانی نۆژداری یان دامەزراوە هاوشێوەکان لە دانیمارك و فنلەندا و ئایسلەند و نەرویژ. |
| ٦- | هەڵمەتێکی نامەناردن کەمترنەبێت لە شەش کۆلێژی تر لە نۆژداریدا کە ئەکادیمیا دیاریاندەکات، لەگەڵ تێبینی کردنی گرنتی دابەشکردنێکی گونجاو بەسەر وڵاتانی جیاوازدا، و سەنگیان لە فێرکاریدا. |
| ٧- | قاڵبوانی زانستی نۆژداری کە دامەزراوەکە بەپێچەوانەوە بە گونجاویان دەزانێت بۆ لێکنزیك بوونەوە. |

# پاڵاوتنی گونجاو بۆ خەڵاتی نۆبڵی وێژە

## Qualified Nominators – The Nobel Prize in Literature

| | |
|---|---|
| ١- | ئەندامانی ئەکادیمیای سوید و ئەکادیمیاکانی تر و دامەزراوە و کۆمەڵەکانی تر کە لە ئامانج و بنیاتدا لەو دەچن. |
| ٢- | پرۆفیسۆرانی وێژە و زانستی زمانەوانی لە زانکۆکان و کۆلێژەکانی زانکۆکان. |
| ٣- | براوەکانی خەڵاتی نۆبڵی وێژەی ساڵانی پێشوو. |
| ٤- | سەرۆکەکانی ئەو کۆمەڵگایانەی کە دانراوەکانیان لە بەرهەمی ئەدەبی تایبەتمەندی وڵاتەکانیان دەنوێنێت. |

# پاڵاوتنی گونجاو بۆ خەڵاتی نۆبڵی ئاشتی

## Qualified Nominators – The Nobel Peace Prize

| | |
|---|---|
| ١- | ئەندامانی کۆمەڵە نیشتیمانییەکان و حکوومەتەکان و ویلایەتەکان. |
| ٢- | ئەندامانی دادگای نێودەوڵەتی. |
| ٣- | زانکۆی ریکتۆرس University rectors، پرۆفیسۆرانی زانستی کۆمەڵایەتی و مێژوو و فەلسەفە و یاسا و زانستی دینی، و بەڕێوەبەرانی ئاشتی و پەیمانگاکانی سیاسەتی دەرەوە. |
| ٤- | براوەکانی خەڵاتی نۆبڵی ئاشتی ساڵانی پێشوو. |
| ٥- | ئەندامانی دەستەی ئەو ڕێخراوانەی کە خەڵاتی نۆبڵیان لە ئاشیدا پێبەخشراوە. |
| ٦- | ئەندامانی کارای پێشووی دەستەی نۆبڵی نەرویژی (ئاشتی). |
| ٧- | راوێژکارانی پێشوو کە لە لایەن پەیمانگای نۆبڵی نەرویژییەوە دادەنران. |

# پاڵاوتنی گونجاو بۆ خەڵاتی نۆبڵی ئابووری

## Qualified Nominators – The Nobel Economic Prize

| | |
|---|---|
| ١- | ئەندامانی سویدی و بیێگانەی ئەکادیمیای پاشایەتی سوید بۆ زانست. |
| ٢- | ئەندامانی دەستەی خەڵاتی سڤێرجیس ریکسبانك Sveriges Riksbank بۆ زانستی ئابووری لە یادی ئەلفرێد نۆبڵدا. |
| ٣- | براوەکانی خەڵاتی نۆبڵی ئابووری ساڵانی پێشوو. |
| ٤- | پرۆفیسۆرانی هەمیشەیی لە بابەتەکانی پەیوەندیداردا لە زانکۆ و کۆلێژی زانکۆکانی سوید و دانیمارك و فنلەندا و ئایسلەند و نەرویژدا. |
| ٥- | هەڵمەتێکی نامەناردن لە کەمتر لە شەش زانکۆ و کۆلێژی زانکۆ کە ئەکادیمیای زانست دیاریاندەکات، لەگەڵ تێبینی کردنی گرنتی دابەشکردنێکی گونجاو بەسەر وڵاتانی جیاوازدا، و سەنگیان لە فێرکاریدا. |
| ٦- | زانایانی تری ئەکادیمیاکە کە خانەنشین بوون کە دامەزراوەکە بەپێچەوانەوە بە گونجاویان دەزانێت بۆ لێکنزیك بوونەوە. |



# کۆمیتەکانی نۆبڵ The Nobel Committees

## کۆمیتەی نۆبڵی ٢٠٠٧ The Nobel Committee 2007



دانیشتووەکان لە چەپەوە بۆ ڕاست، گۆران هانسۆن Göran Hansson، ئۆربان لینداهڵ Urban Lendahl، کلاس کاری Klas Kärre جێگری سەرۆك، بیرتیل فریدهۆڵم Bertil Fredholm، نیلس – گۆران لارسۆن Nils-Göran Larsson. راوەستاوەکان لە چەپەوە بۆ ڕاست، جان ئاندیرسۆن Jan Andersson، ئیرنا مۆلێر Erna Möller سەرۆکی دامەزراوەی نۆبڵ، لارس ئۆلسۆن Lars Olson جێگری سەرۆکی دامەزراوەی نۆبڵ، کارلۆس ئیبانیز Carlos Ibáñez، جۆها کیر Juha Kere، هانس جۆرنڤاڵ Hans Jörnvall سکرتێر. ڕوەستاوەکانی ریزی دووەم لە چەپەوە بۆ ڕاست، چریستیر بیتشۆلتز Christer Betsholtz، پیر- ئۆلۆف بیرگرین Per-Olof Berggren، بۆ ئەنگیلین Bo Angelin، بجۆرن ڤینستڕۆم Björn Vennström. ئەو کەسانەی لە وێنەکەدا نین، بەڵام ئەندامی کۆمیتەکەن. بیرتیل دانیهۆڵت Bertil Daneholt، ماریا ماسۆسی Maria Masucci، راڵف پیتیرسۆن Ralf Pettersson.

## ناونیشانەکانی نووسینگەی کۆمیتەکە

**Office**

**Agneta Sjövall**

**Ann-Margreth Jörnvall**

| | |
|---|---|
| Mail address: | Nobel Forum, Box 270, SE-171 77 Stockholm, Sweden |
| Visiting address: | Nobels väg 1, Karolinska Institutet |
| Phone: | +٤٦-٨-٥٢٤ ٨٧٨ ٠٥، +٤٦-٨-٣٣ ٣٩ ٣١ |
| Fax: | +٤٦-٨-٣٢ ٠٣ ٦٥ |
| Email: | secr@mednobel.ki.se |

## کۆمیتەی نۆبڵی فیزیا

### The Nobel Committee for Physics

کۆمیتەی نۆبڵی ئەکادیمیای پاشایەتی سوید بۆ زانست، لێپرساوە لە هەڵبژاردنی پاڵێوراوان لەو ناوانەی کە لە ڕێگەی نامەوە پێشکەش دەکرێت و کەسانی ڕاسپێردراو هەڵیدەبژێرن. ئەندامانی کۆمیتەی نۆبڵ بۆ ماوەی (٣ ) ساڵ لە نێوان ئەندامانی ئەکادیمیاکەدا دیاری دەکرێن. بۆ پێوانەکردنی لەبارترین پاڵێوراو، کۆمیتەکە یارمەتی دەدرێت لەلایەن ڕاوێژکارانی لێزانی تایبەتمەندەوە.

## کۆمیتەی نۆبڵی فیزیای ٢٠٠٧

### Nobel Committee for Physics 2007

پیر کارڵسۆن Per Carlson سەرۆك، پرۆفیسۆری فیزیای



لارس بیرگستڕۆم Lars Bergström سکرتێر، پرۆفیسۆری فیزیای تیۆری

بۆرجی جۆهانسۆن Börje Johansson ئەندام، پرۆفیسۆری کۆندینسید میتەر فیزیك

بجۆرن جۆنسۆن Björn Jonson ئەندام، پرۆفیسۆری فیزیای بنچینەی

ئنجیمار لۆندستڕۆم Ingemar Lundström ئەندام، پرۆفیسۆری فیزیای تەتبیقی

جۆسیف نۆردگرین Joseph Nordgren ئەندام، پرۆفیسۆری فیزیای تیشکی ئێکس

## کۆمیتەی نۆبڵی کیمیا The Nobel Committee for Chemistry

کۆمیتەی نۆبڵی ئەکادیمیای پاشایەتی سوید بۆ زانست، لێپرساوە لە هەڵبژاردنی پاڵێوراوان لەو ناوانەی کە لە ڕێگەی نامەوە پێشکەش دەکرێت و کەسانی ڕاسپێردراو هەڵیدەبژێرن. ئەندامانی کۆمیتەی نۆبڵ بۆ ماوەی (٣) ساڵ لە نێوان ئەندامانی ئەکادیمیاکەدا دیاری دەکرێن. بۆ پێوانەکردنی لەبارترین پاڵێوراو، کۆمیتەکە یارمەتی دەدرێت لە لایەن ڕاوێژکارانی لێزانی تایبەتمەندەوە.

## کۆمیتەی نۆبڵی کیمیای ٢٠٠٧

### The Nobel Committee for Chemistry2007

گۆران ڤۆن هیجین Gunnar von Heijne سەرۆك، پرۆفیسۆری کیمیای تیۆری

ئاسترید گراسلیۆن Astrid Gräslund سکرتێر، پرۆفیسۆری فیزیایی ئەندامی

پرۆفیسۆر سڤین لیدین Professor Sven Lidin ئەندام، پرۆفیسۆری کیمیای نائەندامی

ئاندیرس لیلجاس Anders Liljas ئەندام، پرۆفیسۆری مۆلکولەر بایۆفیزیك

لارس تیلاندیر Lars Thelander ئەندام، پرۆفیسۆری کیمیای فەسلەجە

هاکان وینیرستڕۆم Håkan Wennerström ئەندام، پرۆفیسۆری کیمیای سروشتی تیۆری.

# کۆمیتەی نۆبڵی فیسیۆلۆجی یان نوژداری

The Nobel Committee for Physiology or Medicine

کۆمیتەی نۆبڵی پەیمانگای کارۆلینسکا، لێپرسراوە لە هەڵبژاردنی پاڵێوراوان لەو ناوانەی کە لە ڕێگەی نامەوە پێشکەش دەکرێت و کەسانی ڕاسپێردراو هەڵیدەبژێرن. ئەندامانی کۆمیتەی نۆبڵ بۆ ماوەی (٣ ) ساڵ لە نێوان ئەندامانی پەیمانگای کارۆلینسکا دیاری دەکرێن. بۆ پێوانەکردنی لەبارترین پاڵێوراو، کۆمیتەکە یارمەتی دەدرێت لە لایەن ڕاوێژکارانی لێزانی تایبەتمەندەوە.

## کۆمیتەی نۆبڵی فیسیۆلۆجی یان نوژداری٢٠٠٧

Nobel Committee for Physiology or Medicine 2007

بیرتیل فریدهۆڵم Bertil Fredholm سەرۆک، پرۆفیسۆری زانستی دەرمانسازی

هانس جۆرنڤاڵ Hans Jörnvall سکرتێر، پرۆفیسۆری نوژداری و کیمیای فەسلەجە

گۆران هانسۆن Göran Hansson ئەندام، پرۆفیسۆری دڵ و دەمارەکانی خوێن

کلاس کاری Klas Kärre ئەندام، پرۆفیسۆری خانە و مایکرۆبایۆلۆژی

نیلس گۆران لارسۆن Nils Göran Larsson ئەندام، پرۆفیسۆری مایتۆکوندریا بۆ ماوەی

ئۆربان لینداهل Urban Lendahl ئەندام، پرۆفیسۆری بۆ ماوەزانی.

## The Nobel Committee for Literature کۆمیتەی نۆبڵی وێژە

کۆمیتەی نۆبڵی ئەکادیمیای سویدی، لێپرسراوە لە هەڵبژاردنی پاڵێوراوان لەو ناوانەی کە لە ڕێگەی نامەوە پێشکەش دەکرێت و کەسانی ڕاسپێردراو هەڵیدەبژێرن. ئەندامانی کۆمیتەی نۆبڵ بۆ ماوەی (٣ ) ساڵ لە نێوان ئەندامانی ئەکادیمیاکەدا دیاری دەکرێن. بۆ پێوانەکردنی لە بارترین پاڵێوراو، کۆمیتەکە یارمەتی دەدرێت لە لایەن ڕاوێژکارانی لێزانی تایبەتمەندەوە.



# کۆمیتەی نۆبڵی وێژە ٢٠٠٧

The Nobel Committee for Literature 2007

پارواستبیرگ Pär Wästberg سەرۆک، نووسەر.

هۆراس ئینگداهڵ Horace Engdahl سکرتێر، پرۆفیسۆر و نووسەر.

کجیڵ ئسپمارک Kjell Espmark ئەندام، پرۆفیسۆری فەخری و نووسەر.

لارس فۆرسیڵ Lars Forssell ئەندام، نووسەر.

کاتارینا فرۆستینسۆن Katarina Frostenson ئەندام، نووسەر.

## The Norwegian Nobel Committee **کۆمیتەی نۆبڵی نەرویژی**

خەڵاتی نۆبڵی ئاشتی دەبەخشرێت لەلایەن دەستەیەکی پێنج کەسییەوە، کە لەلایەن پەرلەمانی نەرویژییەوە دادەنرێت، بە پێی ئەو یاسایانەی کە لە لایەن پەرلەمانەوە پیشاندەدرێت. هەڵبژاردنی دەستەکە بۆ ماوەی شەش ساڵ دەبێت. ئەندامان دەبێت جارێکیتر هەڵبژێردرێنەوە، دەستەکە پیشاندەری پێکهاتەی هێزی پارتە سیاسییەکانی ناو پەرلەمانە. سەرەرای ئەوەی ئەمە پێویست نییە. هەموو ئەندامانی دەستەکە هاولاتی نەرویژین. ئەم لیژنەیە لێپرساوە لە دیاریکردنی براوەی خەڵاتی نۆبڵی ئاشتی.

## کۆمیتەی نۆبڵی نەرویژی ۲۰۰۷

## The Norwegian Nobel Committee 2007

ئۆلی دانبۆڵت مجۆس Ole Danbolt Mjøs سەرۆك، پرۆفیسۆر، دکتۆری نوژداری، پارتی خەڵکی مەسیحی

جیری لۆندیستاد Geir Lundestad سکرتێر، پرۆفیسۆر، بەرێوبەری پەیمانگای نۆبڵ

بیرجی راگنەر فۆر Berge Ragnar Furre ئەندام، مێژوونووس، پرۆفیسۆری زانستی دینی، پارتی چەپی سۆسیالست

سیسیل ماری رۆنبیك Sissel Marie Rønbeck ئەندام، جێگری بەرێوبەری بەرێوبەرایەتی کەلەپووری رۆشنبیری

ئینجیر —ماری یاتیرهۆرن Inger-Marie Ytterhorn ئەندام، راوێژکاری سیاسی گەورە پارتی پێشکەوتنی گروپی پەرلەمانتاران

کاسی فیف فیوڵمان Kaci Five Fullmann ئەندام، راوێژکاری ئیشوکاری گشتی.

## The Economics Prize Committee **کۆمیتەی نۆبڵی ئابووری**

کۆمیتەی نۆبڵی ئەکادیمیای پاشایەتی سوید بۆ زانست، لێپرساوە لە هەڵبژاردنی پاڵێوراوان لەو ناوانەی کە لە رێگەی نامەوە پێشکەش دەکرێت و کەسانی راسپێردراو هەڵیدەبژێرن.



ئەندامانی کۆمیتەی نۆبڵ بۆ ماوەی (٣) ساڵ لە نێوان ئەندامانی ئەکادیمیاکەدا دیاری دەکرێت. بۆ پێوانەکردنی لەبارترین پاڵێوراو، کۆمیتەکە یارمەتی دەدرێت لە لایەن راوێژکارانی لیژانی تایبەتمەندەوە.

## کۆمیتەی نۆبڵی ئابووری ۲۰۰۷

## The Economics Prize Committee 2007

جۆرجین ویبوڵ Jörgen Weibull سەرۆك، پرۆفیسۆری ئابووری

پیتیر ئینگلۆند Peter Englund سکرتێر، پرۆفیسۆری بانك و تەئمین

لارس کالمفۆرس Lars Calmfors ئەندام، پرۆفیسۆری ئابووری نێودەوڵەتی

پیر کرۆسیڵ Per Krusell ئەندام، پرۆفیسۆری ئابووری

کارڵ-گۆستاف لۆفگرین Karl-Gustaf Löfgren ئەندام، پرۆفیسۆری ئابووری

تیمۆ تیراسڤیرتا Timo Teräsvirta ئەندام، پرۆفیسۆری سەرژمێری ئابووری




## The Independence of the Committee **سەربەخۆیی کۆمیتەکە**

لە ساڵی ١٩٠١ و چەندین جار هەوڵدراوە کە کۆمیتەکە سەربەخۆ بێت، بەهەرحاڵ. هەروەك لە وەسیەتنامەکەی نۆبڵدا ئاماژە بە پێکهاتەکەی کراوە، لە دەیەکانی سەرەتادا بە شێوەیەکی توند نە بەسترابووەوە بە دامەزراوەی سیاسی نەرویژەوە بە گشتی، بەڵکو بە حکوومەتەوە. ئەمە لە ساڵی ١٩٣٦دا گۆرا. کاتێك لە ساڵی ١٩٣٥ دا خەڵاتی نۆبڵی ئاشتی بەخشرایە پارێزەرێکی یەهودی ئەڵمانی بەناوی کارڵ ڤۆن ئۆسیتزکیCarl von Ossietzky. ئەم بریارە هەروەك چاوەروانکراو بوو، کاردانەوەی توندی لێکەوتەوە بەتایبەت لەلایەن خودی هیتلەرەوە. وەزیری دەرەوەی نەرویژ و سەرەك وەزیرانی پێشوو هەردووکیان لە گفتوگۆکانی لیژنەکە کشانەوە تا دووپاتی بکەنەوە کە خەڵاتەکە کاری سیاسەتی دەرەوەی نەرویژ نییە. پاش

سالێك، پەرلەمانی نەرویژی بڕیاریدا بە فەرمی ڕێگە بگرێت لە ئەندامانی حکوومەت کە بچنە ناو لیژنەکەوە. گۆڕانی دووەم لە ساڵی ١٩٧٧ دا بوو، کاتێك پەرلەمانی نەرویژی بڕیاریدا کە ئەندامانی لیژنەکە بەشداری نەکەن لە لیژنەکانی تردا کە پەرلەمان خۆی دایان دەنێت. لەو کاتەوە پەرلەمان ئەندام پەرلەمانەکانی پێشوو بە گشتی و خەڵکی تری خاوەن وشیاری و تەجروبەی سیاسی لە لیژنەکەدا دادەنێت.

ڕاوێژکارە پێشکەوتووەکان کاردەکەن لە ژێر فەرمانی سکرتێری کۆمیتەکەدا، ڕاوێژکارە هەمیشەییەکان، یان ڕاوێژکارە بانگێشتکراوە تایبەتمەندەکان بەوەی کە وشیارن لە هەڵبژاردندا. زۆرترین کارەکانیان پێداچوونەوەیە بەو هۆکارە لە بارانەی پاڵێوراواندا تا بکرێنە لیستی کورتکراوە shortlist (جیاکردنەوەی ناوە پێشنیارکراوەکان) بە واتایەکی تر دۆزینەوەی گۆنجاوترین کەس. ڕاوێژکاران ڕاستەوخۆ کەس هەڵناسەنگێنن ئەوە کاری دەستەکەیە (کۆمیتەکە).

سکرتێری لیژنەکە لەسەر هەر پاڵێوراوێك ڕاپۆرت دەنووسێت، کاتێك پەیمانگای نۆبڵی نەرویژی لە ساڵی ١٩٠٤ دا دامەزرا کاری سکرتێر لەلایەن دوو ڕاوێژکاری نیمچە هەمیشەییەوە یارمەتی دەدرا. بۆ ماوەی چەند ساڵێك سێ ڕاوێژکار دانران، کە زانابوون لە یاسای نێودەوڵەتی، مێژوو، ئابووری سیاسیدا. لە هەشتاکاندا، زۆربەی ڕاوێژکارانی هەمیشەی لیژنەکە چواربوون کە پرۆفیسۆر بوون یان لە مێژوودا یان لە زانستی سیاسیدا لە زانکۆ.

## بڕیاری کۆمیتەی نۆبڵی نەرویژی

ڕاگەیاندنی ناوی پاڵێوراوی خەڵاتەکە مێژووەکەی بە جێگیری نەماوەتەوە، بەڵام بە زۆری لە ناوەڕاستی مانگی تشرینی یەکەمدا لە تەلاری پەیمانگای نۆبڵ بە فەرمی ڕادەگەیەنرێت. خەڵاتی نۆبڵ ساڵانە لە ١٠ ی کانوونی یەکەمی هەموو ساڵێکدا دەبەخشرێت، ئەو ڕۆژەی کە نۆبڵی تێدا مردووە لە ساڵی ١٨٩٦ دا. لە ساڵی ١٩٠٥ تا ساڵی ١٩٤٦ ڕێوڕەسمەکە لە پەیمانگای نۆبڵ بەرپادەکرا. لە ساڵی ١٩٤٧ەوە لە زانکۆی ئۆسلۆ، لە ساڵی ١٩٩٠ گوێزرایەوە بۆ هۆڵی شاری ئۆسلۆ. بە پێچەوانەی ڕێوڕەسمی ستۆکهۆڵمەوە سەرۆکی لیژنەی نۆبڵ نەك شای ئەو وڵاتە، دبلۆم و مەدالیاکە پێشکەش دەکات. کە مەبەست لێی سەربەخۆیی لیژنەی نۆبڵە. شای نەرویژ ئامادەی ڕێوڕەسمەکە دەبێت. هەروەك ئەندامانی حکوومەت و پەرلەمان و



خەڵکانی بانگێشت کراو ئامادە دەبن. چەند سەد کورسییەك گیراوە بۆ خەڵکان بە هۆکاری تایبەت کە هیواخوزراوە ئامادەبن لەم ڕێوڕەسمە دیاریکراوەدا.

پاش ماوەیەکی کەم لە ڕێوڕەسمەکە لێکچەری نۆبڵ و ڕێوڕەسمەکە لە زنجیرە کتێبێکی ساڵانەدا بە ناوی Les Prix Nobel بڵاودەکرێتەوە.

## پەیمانگای نۆبڵی نەرویژی The Norwegian Nobel Institute



خانەی پەیمانگاکە لە ئۆسلۆ

پەیمانگای نۆبڵی نەرویژی لە ساڵی ١٩٠٤ دا دامەزراوە، گوێزراوەتەوە بۆ ئەم تەلارەی ئێستای لە ناوەڕاستی شاری ئۆسلۆ، نزیك کۆشکی پاشایەتی. ئەم تەلارە لە ساڵی ١٨٦٧ بنیاتنراوە کە تەلارێکی کلاسیکییە. لە ساڵی ١٩٠٣ دا لە کابرایەکی مەسیحی ناودارکڕاوەتەوە خانووەکە لە دوو شوقەی لێك دابڕاو پێکهاتووە کەلەلایەن پەیمانگاوە بەکارهات ساڵی ١٩٠٥. ئەرکی سەرەکی پەیمانگای نۆبڵ یارمەتی دانی لیژنەی نۆبڵە لە دەستنیشانکردنی براوەی خەڵاتی نۆبڵی ئاشتیدا، ڕێکخستنی ڕێوڕەسمی نۆبڵی ساڵانەیە لە ئۆسلۆ. تا ببێتە ناوەندێکی ناسراوی تایبەتمەند بە ئاشتی و کارو باری نێودەوڵەتی بە گشتی. پەیمانگا تا ئەمڕۆ گەشەیداوە بە کتێبخانەیەك بە قەبارەی ١٨١٠٠٠ کتێب، ئەو ئەدەبیاتەی لە کتێبخانەی ئەم پەیمانگایەدا دەستەبەرە بە شێوەیەکی سەرەکی تایبەتە بە پەیوەندی نێودەوڵەتی. کتێبخانەکە بە ڕووی خەڵکدا کراوەیە و هۆڵێکی خوێندنەوەی نایابی هەیە. هەروەها ئەمڕۆ پەیمانگای نۆبڵ بەشێکی توێژینەوەی تایبەتی هەیە کە پرۆژەی لێکۆڵینەوەی پەیوەند بە کێشەی جەنگ و ئاشتی ڕێکدەخات. بەشەکە پشت دەبەستێت بە بەرنامەی زەمالە بۆ سەردانی زانایان لە سەرجەم جیهانەوە. پەیمانگای نۆبڵ شێوە خوێندنەکەی ڕێخستووە لە شێوەی کۆبوونەوە و زنجیرەی خوێندن و وانە وتنەوەدا، سەرباری هەڵمەتی ناسراو بە کۆڕەکانی نۆبڵ. بۆ گۆڕینەوەی بیروبۆچوون و زانیاری کە تایبەتمەندانی دیار لە وڵاتە جۆراوجۆرەکانەوە بانگهێشت دەکرێن.

## رۆژانی نۆبڵ لە ئۆسلۆ Nobel days in Oslo

ڕێوڕەسمی خەڵاتی نۆبڵی ئاشتی لە ١٠ ی کانوونی یەکەم لە هۆڵی شاری ئۆسلۆ ڕێك دەخرێت، ڕێوڕەسمەکە ڕووداوێکی گرنگە کە براوەی خەڵاتەکە ئامادەی دەبێت.

ڕۆژی ٩ی کانوونی یەکەم

کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانی ڕێك دەخرێت بۆ براوەی خەڵاتی نۆبڵی ئاشتی لە پەیمانگای نۆبڵ لە ئۆسلۆ. بە بانگێشتی کەناڵەکانی ڕاگەیاندن.

١٠ی کانوونی یەکەم

ڕێوڕەسمی خەڵاتەکە لە هۆڵی شاری ئۆسلۆ کە تیایدا براوەی خەڵاتە خەڵاتەکەی پێدەبەخشرێت ڕێکدەخرێت.

١١ی کانوونی یەکەم

جێبەجێکردنی خەڵاتی نۆبڵی ئاشتی لە قوتابخانەی ئۆسلۆ، بە هاوکاری لە نێوان لیژنەی نۆبڵی نەرویژی و لێپرسراوانی قوتابخانەی ئۆسلۆ . قوتابخانەی ئۆسلۆ گرنگی دەدات بە بابەتی تایبەتمەند بە ئاشتییەوە.

ئاهەنگی مۆسیقای خەڵاتی نۆبڵی ئاشتی

هەموو ساڵێك لیژنەی نۆبڵی نەرویژی میوانداری ئاهەنگێکی مۆسیقای ڕێزلێنان بۆ براوەی خەڵاتی نۆبڵی ئاشتی ڕێکدەخات. ئەمەش لە سپیکترۆم Spektrum لە ئۆسلۆ ڕوودەدات.

## بەرنامەکانی هەفتەی نۆبڵ ٢٠٠٧

## Programmer for the Nobel week 2007

(٥) ی کانوونی یەکەم چوارشەمە:

گەیشتنی براوەکان.

(٦) ی کانوونی یەکەم پێنج شەمە:

براوەکان پێکەوە سەردانی مۆزەخانەی نۆبڵ دەکەن بە بوونی ڕێبەرەکان لە مۆزەخانەدا، و ژەمە خواردنێکی سووك، کاتژمێر ١٠ ی بەیانی چاوپێکەوتن لەگەڵ نۆبڵ پرایز دۆت ئۆرگ nobelpraize.org، کۆنگرەی ڕۆژنامەنووسی بۆ براوەی نۆژداری لە کاتژمێر ٢،٣٠ خولەکی



پاش نیوەڕۆ، ئێوارەخوانی ڕێخراو لەلایەن دەستەی نۆبڵەوە، ئێوارەخوانی ڕێخراو لەلایەن ئەنجوومەنی دەستەی خەڵاتی ئابوورییەوە.

(٧) ی کانوونی یەکەم هەینی:

کۆنگرەی ڕۆژنامەنووسی بۆ براوەکانی فیزیا و کیمیا و ئابووری لە ئەکادیمیای پاشایەتی سوید بۆ زانست، کاتژمێر ٩ی بەیانی، نیوەڕۆخوان بۆ براوەی ئابووری لە بانکی ناوەندی سوید، وانەی نۆبڵ لە نۆژداریدا لە هۆڵی وانەکانی جاکوب برزلیوس Jacob Berzelius، تاقیگەی برزلیوس، کاتژمێر ١ بۆ ٣،٣٠ خولەکی پاش نیوەڕۆ، پێشوازی فەرمی براوەی نۆژداری لە پەیمانگای کارۆلینسکا، پێشوازی فەرمی براوەی فیزیا و کیمیا و ئابووری لە ئەکادیمیای پاشایەتی سوید بۆ زانست، وانەی نۆبل لە وێژەدا لە ئەکادیمیای سوید، کاتژمێر ٥،٣٠ خولەکی ئێوارە.

(٨) ی کانوونی یەکەم شەمە:

وانەی نۆبڵ لە فیزیادا، لە ئەولا ماگنا Aula Magna، و زانکۆی ستۆکهۆڵم، کاتژمێر ٩ی بەیانی بۆ ١٠،٤٠ خولەکی بەیانی، وانەی نۆبڵ لە کیمیادا، لە ئەولا ماگنا Aula Magna، و زانکۆی ستۆکهۆڵم، کاتژمێر ١١ی بەیانی بۆ ١١،٥٠ خولەکی بەیانی، وانەی نۆبڵ لە ئابووریدا، لە ئەولا ماگنا Aula Magna، و زانکۆی ستۆکهۆڵم، کاتژمێر ١ی پاش نیوەڕۆ بۆ ٣،٣٠ خولەکی پاش نیوەڕۆ، ئاهەنگی مۆسیقای خەڵاتی نۆبڵ، لە هۆڵی ئاهەنگەکانی ستۆکهۆڵم، کاتژمێر ٧،١٥ خولەکی ئێوارە.

(٩) ی کانوونی یەکەم یەك شەمە:

بەرنامەی نۆبڵ بۆ تەلەفیزیۆن و هۆکانی ڕاگەیاندن لە کتێبخانەی برنادۆت Bernadotte لە کۆشکی پاشایەتی، کاتژمێر ٨،٣٠ خولەکی بەیانی تا ١١،٣٠ بەیانی، نیوەڕۆخوانی میوانداری سەفارەتەکان، کاتژمێر ١٢ی نیوەڕۆ تا ٢ی پاش نیوەڕۆ، پێشوازی فەرمی دامەزراوەی نۆبڵ لە مۆزەخانەی وڵاتانی باکووری ئەورووپا.

(١٠) ی کانوونی یەکەم دووشەمە:

ڕاهێنان لە هۆڵی ئاهەنگەکانی ستۆکهۆڵم، کاتژمێر ١٠،٣٠ بەیانی، ئاهەنگی بەخشینی خەڵاتی نۆبڵ لە هۆڵی ئاهەنگەکانی ستۆکهۆڵم، کاتژمێر ٤،٤٥ خولەکی پاش نیوەڕۆ، ئێوارە خوان لە هۆڵی شاری ستۆکهۆڵم، لە کاتژمێر ٦،٤٠ خولەکی ئێوارە.

(١١) ی کانوونی یەکەم سێ شەمە:

بەرنامەی گەڕان و سەردانی خێزانی بە هاوڕێیەتی ڕێبەرەکان لە ستۆکهۆڵم، و سەردان بۆ مۆزەخانە، و سەردانی تاك بۆ دامەزراوەی نۆبڵ، ئێوارەخوانی پاشایەتی لە کۆشکی پاشایەتی کاتژمێر ٧،١٠ خولەکی ئێوارە.

(١٢) ی کانوونی یەکەم چوار شەمە:

سەردانی تاکەکەسی بۆ دامەزراوەی نۆبڵ هەموو ڕۆژێك.

(١٣) ی کانوونی یەکەم پێنج شەمە:

سەردانی ئارەزوومەندانە بۆ زانکۆکانی سوید و وڵاتانی باکووری ئەورووپا.

## خشتەی کاتی ئێوارە خوانی ٢٠٠٧ لە هۆڵی شاری ستۆکهۆڵم

Time schedule for the banquet in the city hall 2007

کاتژمێر ٦،٣٠ خولەکی ئێوارە میوانەکان پێشوازیان لێدەکرێت لە هۆڵی شین و داوایان لێدەکرێت لە شوێنەکانیان دابنیشن. کاتژمێر ٧،٠٣ خولەکی ئێوارە میوانەکان لەسەر مێزەکانیانن.

کاتژمێر ٧،١١ خولەکی ئێوارە پاشا کە وڵاتەکەی میوانداری ڕووداوەکانی ئەم ئێوارەیەی کردووە پێکێکی پێشکەش دەکرێت لەلایەن ئێم دی ئێچ. سی. مارکۆس ستۆرچ MD h.c. Marcus storch سەرۆکی بەڕێوبەرایەتی دامەزراوەی نۆبڵ. کاتژمێر ٧،١٤ خولەکی ئێوارە میوانەکان پێکەکانیان هەڵدەدەن لە یادی ئەلفرێد نۆبڵدا کە پاشا پێشنیاری دەکات.

کاتژمێر ٧،١٥ خولەکی ئێوارە چوار خولەك بۆ گرتنی وێنە.

کاتژمێر ٧،٢٠ خولەکی ئێوارە سەمای بالی.

کاتژمێر ٧،٢٥ خولەکی ئێوارە بەشی یەکەمی خزمەت.

کاتژمێر ٧،٣٩ خولەکی ئێوارە چوار خولەك بۆ گرتنی وێنە .

کاتژمێر ٧،٤٥ خولەکی ئێوارە سەمای بالی.

کاتژمێر ٨،١١ خولەکی ئێوارە بەشی سەرەکی خزمەت.

کاتژمێر ٩ ی ئێوارە سەمای بالی.

کاتژمێر ٩،١٠ خولەکی ئێوارە پێشکەشکردنی شیرینی.



کاتژمێر ٩،٣٥ خولەکی ئێوارە پێنج خولەك دەرفەت بۆ گرتنی وێنەی مێزە خێزانییەکان و مێزەکانی تر.

کاتژمێر ١٠ ی ئێوارە خوێندکارانی سوید نمایشکردنی ئاڵای سوید.

کاتژمێر ١٠،١٠ خولەکی ئێوارە وتەی براوەکانی نۆبڵ.

کاتژمێر ١٠،٣٠ خولەکی ئێوارە پێدانی ئاماژە بەوەی کەی ویستیان میوانەکان دەتوانن هەستن لەسەر مێزەکان.

سەما لە هۆڵی ئاڵتونی و لەگەڵ ئۆکسترایی ئەمباسادی Ambassadeur.

## بەرنامەی ڕێوڕەسمی بەخشینی خەڵاتی نۆبڵی ٢٠٠٧ لە هۆڵی ستۆکهۆڵم

Nobel Prize award ceremony Programmers 2007 at the Stockholm hall

براوەکانی خەڵاتەکە لەسەر کورسییەکانیان دادەنیشن لەسەر شانۆکە.

-----

وتەیەك لەلایەن ئێم دی ئێچ. سی. مارکۆس ستۆرچ MD h.c. Marcus Storch سەرۆکی بەڕێوەبەرایەتی دامەزراوەی نۆبڵ، سێ خولەك سەمفۆنیای مۆتۆ مۆدیراتۆ Moto Moderato، لەلایەن میندلسۆن بارسۆلدی Mendelssohn-Bartholdy. پێشکەشکردنی خەڵاتی نۆبڵی ٢٠٠٧ ی فیزیا بە بەڕێز دکتۆر پیتەر گرۆنبەرگ Peter Grünberg و بەڕێز پرۆفیسۆر ئەلبەرت فیرت Albert Fert، پاشان وتەیەك لەلایەن پرۆفیسۆر بۆرج جۆهانسۆن Borje Johansson.

-----

پێشکەشکردنی خەڵاتی نۆبڵی ٢٠٠٧ ی کیمیا بە بەڕێز پرۆفیسۆر گێرهارد ئێرتل Gerhard Ertl، پاشان وتەیەك لەلایەن پرۆفیسۆر هاکان وینرستۆم Hakan Wennerstrom.

-----

پێشکەشکردنی پارچەیەك مۆسیقا لەلایەن ئایگۆر ستراڤیسکی Igor Stravinsky.

-----

پێشکەشکردنی خەڵاتی نۆبڵی ٢٠٠٧ ی نۆژداری بە بەڕێز دکتۆر ماریۆ ئار. کاپیچی Mario R. Capecchi و بەڕێز پرۆفیسۆر سێر مارتین جەی. ئیڤانس Sir Martin J. Evans و بەڕێز پرۆفیسۆر ئۆلیڤەر سمیسیس Oliver Smithies، پاشان وتەیەك لەلایەن پرۆفیسۆر کریزتەر باتشۆلز Christer Betsholtz.

-----

پێشکەشکردنی خەڵاتی نۆبڵی ٢٠٠٧ ی وێژە بە بەڕێز دانەر (مۆلف) دۆریس لیسینگ Doris Lessing، پاشان وتەیەك لەلایەن ئۆسۆر پێر واسبەرگ Author Per Wastberg.

-----

پێشکەشکردنی پارچەیەك مۆسیقا لەلایەن جۆرج فریدریك هاندڵ Georg Friedrich handel.

-----

پێشکەشکردنی خەڵاتی نۆبڵی ٢٠٠٧ ی ئابووری بە بەڕێز پرۆفیسۆر ڕۆجەر بی. مارسۆن Roger B. Myerson و بەڕێز پرۆفیسۆر ئێریك سی. ماسکین Eric S. Maskin و بەڕێز پرۆفیسۆر لیوند هۆرویز Leonid Hurwicz، پاشان وتەیەك لەلایەن پرۆفیسۆر جۆرجن دەبڵیوو. ویبوڵ Jorgen W.Weibull.

-----

سرودی نیشتیمانی سویدی DU gamal, Du fria، و ئامادەبوان هۆڵەکە بەجێدێڵن.

نەخشەی هۆڵی شاری ستۆکهۆڵم و بەکارهێنانی لە کاتی بەخشینی خەڵاتی نۆبڵدا

## یاساکانی دامەزراوەی نۆبڵ Statutes of the Nobel Foundation

یاساکان چەند ڕێنماییەکی تایبەت سەبارەت بە خەڵاتەکە لە خۆدەگرێت:

کە لەلایەن ئەکادیمیای پاشایەتی بۆ زانستەکان بۆ خەڵاتەکان لە دامەزراوی نۆبڵ... هتد.

یاساکانی دامەزراوەی نۆبڵ لە پەیمانگای کارۆلینسکا، لەلایەن



حکوومەتی سویدییەوە ڕەزامەندی لەسەر بووە لە ١٩٩٤/٤/٧.

یاساکان ڕێنماییە تایبەتییەکانە کە سەبارەت بە خەڵاتی ئەکادیمیای سویدییە بۆ خەڵاتەکان لە دامەزراوەی نۆبڵەوە،... هتد، لە ٢٠٠٢/٢/٢٢دا پشتگیریی لێکرا.

ڕێنمایی تایبەتی بۆ بەخشینی خەڵاتی نۆبڵ بۆ ئاشتی

پەیمانگای نۆبڵی نەرویژی،...هتد کە لەلایەن کۆمیتەی نۆبڵی سەر بە پەرلەمانی نەرویژییەوە پشتگیریی لێکرا لە ١٩٠٥/٤/١٠ (کە چاکسازییەکانی ساڵانی ١٩٧٧، ١٩٩١، ١٩٩٤، ١٩٩٨ و ٢٠٠٠یش لە خۆدەگرێت).

یاساکانی بانکی سویدی خەڵات لە زانستە ئابوورییەکان بۆ یادی ئەلفرێد نۆبڵ و لەلایەن شانشینەکەوە پشتگیری لێکراوە لە ١٩٦٨/١٢/١٩.

## ئامانجەکانی دامەزراوەکە Objects of the Foundation

١. دامەزراوەکە بەگوێرەی بڕگەکانی وەسیەتنامەی ئەندازیار دکتۆر ئەلفرێد بێرنارد نۆبڵ دامەزرا کە لە ١٨٩٥/١١/٢٧دا نەخشەی بۆ کێشرا، کە لەو بەشانەی پەیوەندی بە بابەتەکەوە هەیە دەڵێت:

" هەموو ئەو موڵکەی کە ماوەمە دەبێت بەم شێوەیەی لای خوارەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت: سەرمایەکە، لەلایەن جێبەجێکارانەوە بە شێوەیەکی ڕاست و دروست لە بواری دراودا بەکاربهێنرێت، ببێتە سەرچاوەیەکی دارایی و سوودەکەی ساڵانە بە شێوەی خەڵات دابەش



بکرێت بەسەر ئەوانەی کە لە ساڵانی دواییدا زۆرترین سوود بە مرۆڤایەتی دەگەیێنن. سوودە ناوبراوەکەش بەسەر پێنج بەشی هاوشێوەدا دابەش دەکرێت بەم شێوەیەی لای خوارەوە: بەشێکی بۆ ئەو کەسەی کە گرنگترین دۆزینەوە یان داهێنانی لە بواری فیزیادا ئەنجامداوە، بەشێکی دیکەشی بۆ ئەو کەسەی کە گرنگترین دۆزینەوەی کیمیایی یان چاکسازیی لەم بوارەدا ئەنجامداوە. بەشێکی دیکەش بۆ ئەو کەسەی کە گرنگترین دۆزینەوەی لە بواری فیسیۆلۆجیادا یان نوژداریدا ئەنجامداوە. بەشێکی دیکەش بۆ ئەو کەسەی کە لە بواری وێژەدا داهێنەر بووەو کارەکەی زۆر نموونەیی بووە. بەشێکی دیکەش بۆ ئەو کەسەی کە زۆرترین و چاکترین کاری کردووە بۆ بەدیهێنانی گیانی برایەتی لە نێو میللەتانداو رەتکردنەوە یان کەمکردنەوەی ژمارەی سوپا ئامادەکان و بانگەوازکردن و سازدانی کۆنفراسی ئاشتی. خەڵاتەکانی فیزیا و کیمیا لەلایەن ئەکادیمیای سویدی بۆ زانستەکان دەبەخشرێت، بۆ بواری فیسیۆلۆجی یان نوژداری لەلایەن پەیمانگای کارۆلینسکا لە ستۆکهۆڵم دەبەخشرێت، بۆ کاری وێژەش ئەکادیمیایەکە لە ستۆکهۆڵم دەیبەخشێت، بۆ پاڵەوانانی ئاشتی خەڵاتەکە لەلایەن کۆمیتەیەکی پێنج کەسییەوە دەبەخشرێت کە لەلایەن پەرلەمانی نەرویژییەوە هەڵدەبژێردرێت. هەر لە حەز و ئاواتی منەوەیە کە نابێت گوێ بدرێتە رەگەزنامەی ئەو کەسانەی کە هەڵدەبژێردرێن بۆ وەرگرتنی خەڵاتەکە، بەڵکو ئەو کەسەی کە زۆر شایستەی ئەو خەڵاتەیە دەبێت وەریبگرێت، جا ئایا خەڵکی وڵاتە ئەسکەندەناڤییەکانە یان نا".

پێویستە بڕگەکانی وەسیەتنامەکە وەك ئەوەی لەسەرەوە باسکرا رەچاوبکرێت لەلایەن دامەزراوەکەوە شانبەشانی لێکدانەوەکان و وردەکاریی رێنماییەکان کە لەم یاسایانەدا خۆی دەبینێتەوەو گەیشتن بە ئەنجامێك کە بگونجێت لەگەڵ میراتگەرانی دکتۆر نۆبڵ لە ١٨٩٨/٦/٥. لەم گونجاندنەشداو لە پاش گەیشتن بە رێکەوتنێك سەبارەت بە بەشێکی کەمی موڵکی دکتۆر نۆبڵ، میراتگرەکان ئاشکرایان کرد کە " ئەوان لێرەدا وەسیەتنامەکەی دکتۆر نۆبڵ پشتڕاست دەکەنەوەو ئامادەن بەبێ هیچ مەرجێك واز لە هەموو مافێکی خۆیان لە موڵکی دکتۆر نۆبڵ بهێنن چ سەبارەت بە خۆیان و چ سەبارەت بە نەوەکانی دوای خۆشیان و بە هیچ شێوەیەك داوای موڵکەکانی دکتۆر نۆبڵ نەکەنەوەو داواش نەکەن بەشداربن لە بەڕێوەبردنیاندا، هەروەها مافی ئەوەیان نەبێت دژ بە بەندەکانی وەسیەتننامەکە بوەستنەوە یان دژی هەر بڕگەیەکی دیکە سەبارەت بە جێبەجێکردنیو یان



بەکارهێنانی سوودی ئەو پارەیەی کە چنگ دەکەوێت لە، ئێستا یان لە داهاتوودا، لەلایەن شانشینەکەوە یان هەر چ لایەنێکی پەیوەندیدار ئاڕاستە بکرێت، لەگەڵ ئەوەشدا دووچاری ئەم خاڵانەی لای خوارەوەش دەبێتەوە:

ئەو یاسایانەی، کە باوە لەلایەن پەیمانگاکانی بەخشینی خەڵاتەکەوە، کە مامەڵە لەگەڵ شێوازی بەخشینی خەڵاتەکە دەکەن وەك ئەوەی کە لە وەسیەتنامەکەدا هاتووە، دەبێت بەراوێژکاری لەگەڵ نوێنەرێك کە لەلایەن خێزانەکەی رۆبێرت نوبڵەوە دیاریکرابێت نەخشەی بۆ بکێشرێت و دەبێت پێشکەش بکرێت بۆ ئەوەی لەلایەن شانشینەکەوە پشتڕاست بکرێتەوە.

دەبێت هیچ لادانێك نەبێت لەم پرەنسیپە سەرەکیانەی لای خوارەوە: هەریەك لە خەڵاتە ساڵانەکان کە بە هۆی وەسیەتنامەکەوە پێکهێنراوە دەبێت لایەنی کەم لە ماوەی هەموو پێنج ساڵێکدا ببەخشرێت لەو ساڵەی کە یەکسەر لەپاش دەست بەرکاربوونی کارەکانی دامەزراوی نۆبڵەوە.

بڕی ئەو خەڵاتە کە دەبەخشرێت نابێت لە ژێر هیچ بارودۆخێکدا کەمتر بێت لە ٦٠٪ ئەو پارەیەی کە لە داهاتی دارایی سندووقەکە دایە و ئامادەبێت بۆ ئەوەی وەك خەڵات ببەخشرێت، و ناشبێت دابەش بکرێت بۆ زیاتر لە سێ خەڵات".

٢. "ئەکادیمیای ستۆکهۆڵم" کە لەوەسیەتنامەکەدا باسکراوە، مەبەستی لە ئەکادیمیای سویدییە.

دەستەواژەی "ئەدەبی" تەنها وشە جوانەکان ناگرێتەوە، بەڵکو نووسینەکانی دیکەش کە بە هۆی شێوە و شێوازەکەی بەهایەکی ئەدەبی هەبێت.

ئەو ئەرکانەی دەکەوێتە ئەستۆی پەیمانگای کارۆلینسکا لە چوارچێوەی وەسیەتنامەکەدا لەلایەن دامەزراوەی نۆبڵی پەیمانگای کارۆلینسکا جێبەجێ دەکرێت. ئەو بەندەی لەوەسیەتنامەکەدا هاتووە، کە خەڵاتە ساڵانەکان دەبێت تەرخان بکرێت بۆ ئەو کارانەی کە لە ساڵانی رابردوودا ئەنجامدراوە، دەبێت بە شێوازێك لێکبدرێتەوە کە دەبێت خەڵاتەکان بدرێت بە دوایین کارە جێبەجێکراوەکان لە بوارەکانی کەلتووردا کە لە وەسیەتنامەکەدا ئاماژەی بۆ کراوەو بۆ کارە کۆنەکان تەنها ئەگەر هاتوو گرنگییەکانیان تا ئەم دواییە دەرنەکەوتووبێت.

٣. بۆ ئەوەی شایستەی ئەوە بێت خەڵات وەربگرێت، دەبێت کارە نووسراوەکە بە شێوەی چاپ دەرچووبێت یان بە شێوازێکی دیکە بڵاوکرابێتەوە، بۆ ئەوەی خۆی بڕیار بدات لەلایەن هەر دەستەیەکی بەخشینی خەڵاتەوە.

٤. دەکرێت بڕی پارەی خەڵاتێك بەیەکسانی دابەشبکرێت بەسەر دوو کاردا، کە هەریەکەیان شایستەی ئەو خەڵاتە بێت. ئەگەر هاتوو کارێکیش خەڵاتکراو لەلایەن دوو یان سێ کەسەوە بەرهەمهێنرابوو، ئەوا خەڵاتەکە بە هاوبەشی بەسەر هەموویاندا دابەشدەکرێت. بە هیچ شێوەیەکیش ناکرێت بڕی پارەی خەڵاتێك دابەشبکرێت بەسەر زیاتر لە سێ کەسدا.

ئەو کارەی کە لەلایەن کەسێکەوە بەرهەمهێنرا بێت لە کاتی مردنییەوە بەهەند وەرناگیرێت بۆ بەدەستهێنانی خەڵاتێك. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەگەر براوەی خەڵاتەکە مرد پێش ئەوەی خەڵاتەکەی وەربگرێت، ئەوا دەکرێت خەڵاتەکە پێشکەش بکرێت.

هەر دەستەیەکی بەخشینی خەڵات سەرپشکە لە بڕیاردان بە بەخشینی خەڵاتەکە بە دامەزراوەیەك یان ڕێخراوێك.

٥. دەکرێت خەڵات نەبەخشرێت بەکارێك، تا لە ڕێی تەجرووبە و پشکنینێکی وردەوە، کە لە لایەن پسپۆڕانەوە ئەنجام دەدرێت، بۆیان دەردەکەوێت کە کارەکە ئەو گرنگییەی هەیە، کە لە وەسیەتنامەکەدا هاتووە.

ئەگەر هیچ کام لە کارەکانی بەردەست ئەو گرنگییەیی کە لە خاڵی یەکەمدا باسکرا تێدا نەبوو، ئەوا خەڵاتەکانی هەڵدەگیرێت بۆ ساڵی دواتر. ئەگەر، لەو کاتەشدا، ئەگەری بەخشینی خەڵاتەکە هەر نەبوو، ئەوا بڕی پارەکە دەخرێتە سەر پارەی دامەزراوەکە.

٦. بۆ هەر خەڵاتێك کە لەلایەن دەستەی بەخشینی خەڵاتی سویدییەوە دەبەخشرێت، ئەوا ئەو دەستەیە هەڵدەسێت بە پێکهێنانی کۆمیتەی نۆبڵ کە لە سێ، یان چوار یان پێنج کەس پێکدێت، بۆ ئەوەی ڕای خۆیان دەرببڕن سەبارەت بە مەسەلەی بەخشینی خەڵاتەکە. ئەو حوکمەی پێویستە بۆ بەخشینی خەڵاتی ئاشتی دەبێت لەلایەن کۆمیتەیەکی پەرلەمانی نەرویژییەوە، کە لە وەسیەتنامەکەدا هاتووەو بە کۆمیتەی نەرویژی نۆبڵ ناسراوە، ئەنجام بدرێت.

ڕەگەزنامەی یان ئەندامێتی سویدی بۆ پەیمانگای بەخشینی خەڵات نابێتە هاندەرێکی گرنگ بۆ هەڵبژاردن بۆ ئەندامێتی کۆمیتەی نۆبڵ. کەسانێك کە نەرویژیش نەبن دەکرێت ببنە ئەندام لە کۆمیتەی نەرویژی نۆبڵدا.

هەر ئەندامێکی کۆمیتەی نۆبڵ بڕێك پارە وەردەگرێت بەرامبەر بەو ئیشەی دەیکات، ئەو بڕە پارەیەش دەستەی بەخشینی خەڵات دیاری دەکات.

ئەگەر بە هۆی چەند هۆیەکی تایبەتییەوە پێویستی کرد، ئەوا دەستەی بەخشینی خەڵات مافی دیاریکردنی پسپۆڕەکانی پێدەبەخشرێت بۆ ئەوەی بەشداربن وەك ئەندامان لە گفتوگۆو بڕیارەکانی کۆمیتەی نۆبڵدا.



٧. بۆ ئەوەی شایستەی خەڵاتێك بێت، زۆر گرنگە بە نووسراو هەڵببژێردرێت لەلایەن کەسێکی شارەزاوە. هەر داواکارییەکی تایبەتی بۆ بەدەستهێنانی خەڵات بە هیچ شێوەیەك بەهەند وەرناگیرێت.

ململانێ بۆ پێکەشکردنی ناوی پاڵێوراوەکان دەبێت ئەرکی نوێنەرەکان بێت، چ کەسانی ناوخۆ بن یان بێگانە، لە بواری کەلتووردا، بەهاوتایی لەگەڵ ڕێنماییەکاندا کە لەلایەن دەستەی بەخشینی خەڵاتەوە دەردەچێت.

هەموو ساڵێکیش دادوەرەکانی خەڵات دەبێت ئەم پاڵێوراوانە لە خۆبگرێت کە لە دوازدە مانگی ڕابردوودا تا ١ی شوبات پێشکەشکرا. ئەگەر جگە لە خەڵاتی ئەم ساڵ، دەستەی بەخشینی خەڵات پارەی خەڵاتی مۆڵکراوی لە ژێر دەستدابوو وەك لە خاڵی پێنجەمدا باسکرا، ئەوا مەسەلەی بەخشینی خەڵاتەکە بۆ ئەمساڵ بڕیاری لەسەر دەدرێت پێش ئەوەی بڕیار بدرێت سەبارەت بەو پارەیەی کە مۆڵکراوە لە ساڵانی ڕابردووەوە.

٨. پاڵاوتنەکە دەبێت ڕوون بکرێتەوە و بە بڵاوکراوەکان و بەڵگەنامەی دیکە هاوپێچ بکرێت بۆ پشتگیرییکردن لە پاڵێوراوەکە.

هەر دەستەیەکی بەخشنی خەڵات بڕیار دەدات سەبارەت بە چۆنێتی پێشکەشکردنی بەڵگەنامەکان.

ئەگەر هاتوو بابەتە کاندیدکراوەکە بە زمانێك نووسرابوو، کە ناتوانرێت وەربگێڕدرێت بەبێ ئەوەی دووچاری گرفتێکی تایبەتی نەبیتەوە یان بە هۆی تێچوونی زۆرەوە، یان ئەگەر توانرا هەڵسەنگاندنێك بۆ کاری پێشنیازکراو بکرێت، ئەوا دەستەی بەخشینی خەڵات دەبێت بە پلەی یەکەم شارەزایی تەواو پەیدا بکات سەبارەت بە ناوەڕۆکی ئەو دۆکیومێنتەی کە بەو زمانە نووسراوە، دەستەی بەخشینی خەڵات پەیوەست نابێت بە وەرگرتنی کاندیدکردنەکە بۆ مەبەستی دیکە.

٩. لە ڕۆژی ئاهەنگی دامەزراوەکەدا، کە ڕێکەوتی (١٢/١٠)ەیە، کە ئەویش ساڵیادی مردنی خاوەنی وەسیەتنامەکەیە، هەریەك لە دەستەکانی بەخشینی خەڵاتەکان پێویستە چەکێك بەبڕی پارەی خەڵاتەکە پێشکەش بە براوەی خەڵاتەکە بکەن، هەروەها بڕوانامەیەك و میدالیایەکی ئاڵتوونی کە وێنەی خاوەنی وەسیەتنامەکەو تۆمارێکی گونجاوی لەسەرە.

ئەگەر هاتوو براوەی خەڵاتێك خەڵاتەکەی ڕەتکردەوە، یان پێش (١/١٠) بەگوێرەی ڕۆژ ژمێری ساڵانە و یەکسەر پاش دەرکردنی چەکی پارەکە لەلایەن دەستەی بەخشینی خەڵاتەکە

بەو ڕێگایەی کە لەلایەن دەستەکەوە دیاری دەکرێت، ئەوە بڕی پارەی خەڵاتەکە دەخرێتە سەر پارەی دامەزراوەکە.

پێویستە لەسەر براوەی خەڵاتەکە، هەر کاتێك بۆی کرا، وانەیەك (لێکچەرێك) سەبارەت بەو بابەتە بڵێتەوە کە خەڵاتەکەی لەسەر وەرگرتووە. ئەم وانەیەش دەبێت پێش، یان کەمتر لە شەش مانگ لە پاش ڕۆژی ئاهەنگەکەوە لە ستۆکهۆڵم، بووترێتەوە، یان ئەگەر لە حاڵەتی خەڵاتی نۆبڵی ئاشتیدا بێت، ئەوا لە ئۆسلۆ دەبێت.

١٠. نابێت هیچ نارەزاییەك دژ بە بڕیاری هیچ دەستەیەکی بەخشینی خەڵات بدرێت سەبارەت بە بەخشینی خەڵاتێك.

ناکرێت ڕێگا بدرێت بەو پێشنیارانەی کە وەردەگیرێت سەبارەت بە بەخشینی خەڵاتێك، هەروەها ڕێگا نادرێت بە لێکۆڵینەوە و بیروڕا سەبارەت بە بەخشینی خەڵاتەکە.

ئەگەر هاتوو ڕادەربڕینێکی جیاواز هەبوو کە پەیوەستە بە بڕیاری دەستەی بەخشینی خەڵات سەبارەت بە بەخشنی خەڵاتێك، ئەوا دەکرێت ئەمە لە تۆمارەکەدا نەنووسرێت، جگە لەوە شتی دیکە ڕێگەپێدراوە.

لەگەڵ ئەوەشدا، دەستەی بەخشینی خەڵات دەتوانێت، پاش تێروانین بۆ هەر حاڵەتێك بەجیا، ڕێگەبدات بە پێداچوونەوەی ئەو بابەتانەی کە وەك بناغە پەیڕەویان کردووە بۆ هەڵسەنگاندنیان سەبارەت بە بەخشینی خەڵاتەکە، بۆ مەبەستەکانی لێکۆڵینەوە لە مێژووی فیکرییدا. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم جۆرە ڕێگەپێدانە نابەخشرێت تا پەنجا ساڵ تێپەڕنەبێت بەسەر ئەو بەروارەی کە بڕیارەکەی تیادا دراوە.

١١. دەبێت دەستەی دامەزراوەکە سنووری دارایی دابنێت لەسەر ئەو کارەی کە دەستەکانی بەخشینی خەڵات ئەنجامی دەدەن بەگوێرەی ئەم یاسایانە. چوارچێوەی بەخشینەکان، کە دەستەکە ساڵانە ئامادەی دەکات بۆ دەستەکانی بەخشینی خەڵات، دەبێت بەهەمان شێوە ئەو برە پارانە لە خۆ بگرێت کە تەرخان دەکرێت بۆ گەشەپێدان و چاکسازی ئەم جۆرە پسپۆڕێتییە وەك پێویست دەکات بۆ جێبەجێکردنی کاری دادوەری (تحکیم).

١٢. بەمەبەستی یارمەتیدانی لە وردی ئەنجامدانی کاری دادوەری خەڵاتەکەو بۆ بەرز ڕاگرتنی ئامانجەکانی دامەزراوەکە بە ڕێگای دیکە، دەستەکانی بەخشینی خەڵات دەکرێت پەیمانگاکانی نۆبڵ دابمەزرێنن. هەر پەیمانگایەکی نۆبڵ دەبێت لە سایەی سەرکردایەتی دەستەی بەخشینی خەڵاتدا بێت کە دایمەزراندووە.



## دەستەی ئەنجوومەنی دامەزراوەکە

## The Board and Administration of the Foundation

١٣. دامەزراوەکە لەلایەن ئەنجوومەنێکی بەڕێوەبەرانەوە نوێنەرایەتی دەکرێت، کە ئۆفیسی تۆماری خۆی هەیە لە شاری ستۆکهۆڵم و لە حەوت ئەندام و دوو جێگر پێکدێت، هاوڵاتی سویدی یان نەرویژی بن، کە لەلایەن ڕاسپێردراوەکانی دەستەکانی بەخشینی خەڵاتەوە هەڵدەبژێردرێن. ئەنجوومەنەکەش سەرۆکێك لە یەکێك لە ئەندامەکانی خۆی هەڵدەبژێرێت، لەگەڵ جێگری سەرۆك و بەڕێوەبەری جێبەجێکار. ئەندامان و جێگرانیش بۆ ماوەی دوو ساڵ دیاری دەکرێن، کە لە (٥/١)ەوە دەستپێدەکات.

پێویستە لەسەر ڕاسپێردراوەکانی دەستەکانی بەخشینی خەڵات بڕیاربدەن لەسەر بڕەپارەیەکی گونجاو کە بە شێوەیەك دەدرێت کە لەلایەن ئەنجوومەنەکەوە دەخرێتە بەردەستی هەموو ئەندامەکان بۆ بڕیاردان، جگە لە بەڕێوەبەری جێبەجێکار، چونکە مافی وەرگرتنی پارەی نییە وەك ئەندامێکی ئەنجوومەنەکە. هەروەها پێویستە ڕاسپێردراوەکان بڕیار لەسەر بڕە پارەیەکی گونجاو بدەن بۆ ئەو کەسانەی هەڵدەستن بەکاری پێداچوونەوە (مدقق). ئەنجوومەنەکە خۆی هەڵدەستێت بە دیاریکردنی موچەی بەڕێوەبەری جێبەجێکار.

١٤. پێویستە ئەنجوومەنەکە موڵکەکانی دامەزراوەکە بەڕێوەبەرێت بۆ ئەوەی بتوانێت توانایەکی خەڵات بەخشینی درێژخایەنی باش دابین بکات و بەهای ڕاستەقینەی موڵکەکانی دامەزراوەکە بپارێزێت.

دەبێت ئەنجوومەنەکە ئەوە مسۆگەر بکات کە دامەزراوەکە داهاتێکی باش بەدەست دەهێنێت بە هۆی بەکارهێنانی ڕاست و دروستی پارەکانەوە.

هەروەها ئەنجوومەنەکە بۆی هەیە ئەو داهاتانە بەکاربهێنێت کە بە هۆی فرۆشتنی موڵکەکانی دامەزراوەکەوە بۆ بەخشینی خەڵات و مەسروفاتەکان چنگی دەکەوێت، بۆ ئەو ئاستەی کە ئەو داهاتانە پێویست نابێت بۆ پاراستنی توانایەکی باشی بەخشینی خەڵات و پاراستنی بەهای موڵکەکانی دامەزراوەکە بە شێوە ڕاستەقینەکەی، یان ئەگەری ئەوەی کە لە سەرەوەدا باسکرا بە جۆرێکی دیکە بەکاربێت.

لە کۆی داهاتی ساڵانە، ئەوا لانی کەم دەبێت دە یەکی داهاتەکە بخرێتە سەر پارەی دامەزراوەکە.

١٥. پێویستە ئەنجوومەنەکە یاسا بۆ کارەکان دابنێت، لەوانە ڕێنماییەکان بۆ کارەکانی ئەنجوومەنەکە خۆی و بەڕێوەبەری جێبەجێکار و فەرمانبەرەکانی دیکەی دامەزراوەکە.

١٦. نابێت ئەنجوومەنەکە هیچ بڕیارێك سەبارەت بە هیچ مەسەلەیەك بدات ئەگەر هاتوو ئەندامەکانی لە چوار ئەندام کەمتربوون.

دەنگدانیش دەبێت بە شێوەیەکی ئاشکرا بێت. سەبارەت بە مەسەلەی هەڵبژاردنی ئەندامێکی ئەنجوومەنەکە بۆ پۆستێك، لەگەڵ ئەوەشدا، ئەگەر تەنها ئەندامێك داوایکرد، ئەوا دەنگدانەکە بە شێوەیەکی نهێنی ئەنجام دەدرێت. ئەگەر هاتوو دەنگەکان بەرامبەر بوون و بیروراکان جیاواز بوون و تەنها زۆرینەیەکی کەم پێویست بوو، ئەوا رای سەرۆك زاڵ دەبێت. لە هەڵبژاردنی سەرۆکداو لە هەڵبژاردنی دیکەدا کە بەنهێنی ئەنجام دەدرێت، لەگەڵ ئەوەشدا، لە کاتی یەکسانبوونی دەنگەکاندا، ئەوا مەسەلەکە لە رێگای راکێشانەوە (قرعە) بڕیاری لەسەر دەدرێت.

## راسپێردراوەکانی دەستەکانی بەخشینی خەڵاتەکە

## The Trustees of the Prize-Awarding Bodies

**١٧**. پێویستە لەسەر دەستەکانی بەخشینی خەڵات پازدە راسپێردراو هەڵبژێرن، بۆ ماوەی دوو ساڵ. شەشیان لەلایەن ئەکادیمیای زانستەوە هەڵدەبژێردرێن و سیانیان لەلایەن هەریەك لە دەستەکانی بەخشینی خەڵاتەوە. پێویستە ئەکادیمیای زانستەکان چوار جێگر هەڵبژێرێت و هەریەك لە دەستەکانی دیکەی بەخشینی خەڵات دوو جێگر هەڵبژێرێت.

پێویستە راسپێردراوەکان سەرۆکێك لە نێو خۆیاندا هەڵبژێرن. ئەوان بۆ هەڵبژاردنێکی وەها بانگهێشت دەکرێن لەلایەن پیرترین راسپێردراو لە ئەکادیمیای زانستەکاندا.

بۆ دەرکردنی بڕیارێك، پێویستە لانی کەم نۆ راسپێردراو ئامادەبێت. ئەگەر هەر دەستەیەکی بەخشینی خەڵات هەڵبژاردنی راسپێردراوەکانی پشتگوێ خست، ئەوا ئەمە نابێتە رێگر لەبەردەم راسپێردراوەکانی دیکەدا بۆ ئەوەی بڕیارەکانی خۆیان بدەن.

## پێداچوونەوە وردبینی (تدقیق) Auditing

**١٨**. پێویستە بەڕێوەبەراتی ئەنجوومەنەکە و ژمێریاریی دامەزراوەکە لە هەموو ساڵێکدا لەلایەن شەش وردبینەوە بپشکنرێن. پێویستە یەکێك لە وردبینەکانی حکومەت دەستنیشان



بکرێت پێش دەستپێکردنی ساڵ. ئەو وردبینەش دەبێتە سەرۆکی ئەوانی دیکە و پێویستە دەستەکانی بەخشینی خەڵاتیش وردبینێك هەڵبژێرن و هەروەها راسپێردراوەکانیش دەبێت وردبینێك هەڵبژێرن. ئەو وردبینەی کە لەلایەن راسپێردراوەکانەوە هەڵدەبژێردرێت دەبێت ژمێریارێکی گشتی رێگەپێدراو بێت.

١٩. پیش کۆتایی مانگی شوبات، پێویستە ئەنجوومەنەکە راپۆرتێکی ساڵانە پێشکەش بکات بە سەرۆکی وردبینەکان. پێش (٤/١) پێویستە وردبینەکان پشکنینەکانیان تەواو کردبێتو راپۆرتەکانیان پێشکەش بە راسپێردراوەکانی دەستەکانی بەخشینی خەڵات و ئەنجوومەنیان کردبێت.

ئەگەر دەستەیەکی بەخشینی خەڵات هەڵبژاردنی وردبینێکی پشتگوێخست، یان وردبینەکە، پاش بانگهێشتکردنی بۆ کۆبوونەوە، نەیتوانی ئامادەبێت، ئەوا ئەمە نابێتە بەربەست لەبەردەم وردبینەکانی دیکە بۆ جێبەجێکردنی پشکنینەکانیان.

٢٠. وردبینەکان لە هەموو کاتێکدا بۆیان هەیە بە سەربەستی بە هەموو کتێب و حسابات و دۆکیومێنتەکانی دیکەی دامەزراوەکەدا بچنەوە. ئەنجوومەنەکەش هەموو ئەو زانیارییانەی کە داوای دەکات سەبارەت بە بەڕێوەبردنی بۆی دابین دەکات. پێویستە لانی کەم، جارێك لە ساڵێکدا، وردبینەکان کاری پشکنین و پێداچوونەوە بۆ پارەوپوولی دامەزراوەکە بکەن.

٢١. لەسەر بنەمای راپۆرتی وردبینەکان، راسپێردراوەکانی دەستەی بەخشینی خەڵات رێگەپێدراون بە ئەستۆپاکی ئەنجوومەنەکە لە لێپرسراوێتی کەسیی لە بەڕێوەبردندا لە کاتی ساڵی ئامادەکردنی راپۆرتەکەدا یان هەڵسان بەکارێکی وەها دژ بە ئەنجوومەنەکە یان هەر ئەندامێکی دیکە کە دەکرێت راپۆرتەکەی وردبینەکان بیگرێتەوە.

## چاککردنی ئەم یاسایانە Amendment of these Statutes

**٢٢**. ئەو پرسیارانەی سەبارەت بە چاککردنی ئەو یاسایانەن لەوانەیە لەلایەن هەر دەستەیەکی بەخشینی خەڵاتەوە لە رێگەی راسپێردراوەکانەوە یان ئەنجوومەنەوە بورووژێنرێت. سەبارەت بەو پێشنیارانەی کە لەلایەن دەستەیەکی بەخشینی خەڵاتەوە یان ئەنجوومەنەوە دەخرێتەڕوو، ئەوا پێویستە راسپێردراوەکان رای خۆیان دەربڕن.

پێش ئەنجوومەنەکە، بەپەیڕەویکردنی یاسای دامەزراوەکانی سویدی، دەنگدان سەبارەت بە پێشنیاری چاککردنی یاساکان کە بەگوێرەی پارەگرافی یەکەم ورووژێنرا، ئەوا پێویستە دەستەکانی بەخشینی خەڵات پێشنیارەکە تاوتوێ بکەن. لە بڕیاردان لەسەر ئەم جۆرە پێشنیارە، ئەکادیمیای زانستەکان مافی دوو دەنگی دەبێت و دەستەکانی دیکەی بەخشینی خەڵات تەنها دەنگێك بۆ هەریەکەیان. ئەگەر پێشنیارەکە شکستی هێنا لە دابینکردنی لانی کەم سێ دەنگ، یان ئەگەر ئەم پێشنیارە دژ بە بەرژەوەندی تەنها یەکێك لە دەستەکانی بەخشینی خەڵات بوو، ئەو دەستەیەش پێشنیارەکەی پشتڕاست نەکردەوە، ئەوا ئەنجوومەنەکە ناتوانێت ئەو پێشنیارە لە خۆبگرێت (تبنی). ئەگەر هەر لایەنێك، لە ماوە چوار مانگدا لە وەرگرتنی ئاگادارییەك سەبارەت بەم مەسەلەیە، نەیتوانی رای خۆی دەربڕێت سەبارەت بەو پێشنیارەی کە پێشکەشکراوە، ئەوا ئەوە نابێتە بەربەستێك لەبەردەم بڕیاردان سەبارەت بەم مەسەلەیە.

## هۆڵی پێشکەشکردنی خواردن:

ئامادەکاری بۆ کاتی پێشکەشکردنی خواردن بە پێشکەتووترین تەکنەلۆژیا و رووناکی لە هۆڵی شاری ستۆکهۆڵم، کە بە سیستەمێکی وایەر لێسی پێشکەوتوو دەستی بەسەرداگیراوە، و دوری نێوان پێکهاتەی هۆڵەکە بە هۆی ئەم سیستەمەوە دەستی بەسەردا گیراوە وە دەپارێزرێت. ئۆلا میلزیگ (Ola Melzig)ی بەڕێوبەری بەرهەمهێنانی پێکهاتەی هۆڵەکە دەڵێت، من حەزم لەم بەرهەمە هەیە، چونکە زۆر کات و پارەم دەست دەکەوێت.کە لە (هۆڵی شین) هۆڵی شاری ستۆکهۆڵم، لە ١٠ ی کانوونی



هۆڵی مالمۆ



یەکەمی هەموو ساڵێك رێکدەخرێت. کە جێگای ئامادەکراو بۆ ١٣٠٠ میوان ئامادەیە. ئەو کەسانەی کە خواردنەکە پێشکەش دەکەن جلی چاکەتی سپی و کراس و هێلەکی سپی و پانتۆڵ و پێڵاوی رەش دەپۆشن. ئەم هۆڵە کە یەکێکە لە بیناکانی سوید لە ساڵانی ١٩١١ – ١٩٢٣ لە لایەن راگنەر ئۆستبیرگ Ragnar Östberg وە بنیاتنراوە. بە ئلهام وەرگرتن لە کۆشکەکانی سەردەمی رێنسانسەوە. ئێوارەی نۆبڵ لە لایەن (ئێچ ئۆ سی) HOC پێشکەش دەکرێت لە مالمۆ Malmo ی سویدە. خەونێکە کە دەبێتە راستی. لە حوزەیرانی ٢٠٠٦دا. ئێوارەی نۆبڵ لە مالمۆ لەگەڵ باشترین مۆسیقارە لاو و گۆرانی بێژە سویدییەکانی ئەمڕۆ بەڕێکرا، بەڕێزان میشێل نۆبڵ Michael Nobel و پیتەر نۆبڵ Peter Nobel بەژدار و قسەکەری سەرەکی بوون، کە سێهەم نەوەی خانەوادەی دامەزرێنەری خەڵاتەکە ئەلفرێد نۆبڵن. کە سەرۆك و سکرتێری تابلۆی خانەوادە و دامەزراوەی نۆبڵن. ئەم ئێوارەیە تاقیکردنەوەیەکی رۆشنبیرییە لەسەر و باری ئاساییەوەیە، و نایابە. کە ئەم خواردنە لەگەڵ لیستی نۆبڵی راستەقینەدا بخۆین. ئێوارەی نۆبڵ لە مالمۆ رێکخراوە وەك ئەوەی لە ستۆکهۆڵم رێکخراوە. لەگەڵ مۆسیقارە لاوە دیارەکانی سویدی ئەمڕۆ. ئێوارەی نۆبڵ لە ستۆکهۆڵم بە ژەمە ئێوارەیەکی زۆر نایابی دنیا دەژمێردرێت. ئێوارەی نۆبڵ لە هۆڵی شاری مالمۆ، کە بینایەکی زۆر جوانە لەگەڵ ژوورێکی نان خواردنی نایاب کە فەزایەکی نایاب بە رێکخستنێکی جوانی دەگمەن نیشان دەدات. رێوڕەسمی خەڵاتی نۆبڵی ئاشتی، لە هۆڵی شاری ئۆسلۆ بەڕێوە دەچێت لە نەرویژ، بۆچی لە ئۆسلۆ (نەرویژ)؟ لە کاتێکدا هەموو خەڵاتەکان لە ستۆکهۆڵم دەبەخشرێن؟ لەبەرئەوەی خواستی نۆبڵ وابووە، لە وەسیەتەکەیدا هاتووە کە دەستەیەکی پێنج کەسی لە لایەن پەرلەمانی نەرویژییەوە هەڵبژێردرێن، براوەی خەڵاتی ئاشتی دەستنیشان بکەن. رێوڕەسمی خەڵاتی نۆبڵی ئاشتی بۆ ماوەی چەند ساڵێك لە پەیمانگای نۆبڵ بەڕێوەدەچوو لە ئۆسلۆ، لە ساڵی ١٩٤٧ەوە تاساڵی ١٩٩٠ لە هۆڵی زانکۆی ئۆسلۆ بەڕێوە دەچوو، لە ساڵی ١٩٩٠ تا ئێستا گوێزراوەتەوە بۆ هۆڵی شاری ئۆسلۆ.

## چەند دیمەنێکی دابەشکردنی خەڵاتەکانی نۆبڵ لە هەردوو شاری ستۆکهۆڵم و ئۆسلۆ





## پاڵاوتن بۆ خەڵاتی نۆبڵ Nomination for the Nobel Prizes

هەموو ساڵێك دەستە تایبەتەکانی نۆبڵ نامەی تایبەت دەنێرن بۆ هەزاران کەسایەتی ئەکادیمی، مامۆستای زانکۆ، زانایان لە وڵاتانی جیاواز، براوەکانی خەڵاتی نۆبڵی پێشوو، ئەندامانی کۆمەڵەو پەرلەمانەکان، داوایان لێدەکەن پاڵێوراوی ساڵی داهاتوو بۆ خەڵاتەکانی نۆبڵ دیاریبکەن. کە ئەم هەڵبژاردنە لە ژمارەیەك وڵات ژمارەیەك کەسایەتی و رێخراو دیاریدەکات بە تێپەڕبوونی کات.



## ڕێوڕەسمی بەخشینی خەڵاتی نۆبڵ

## The Nobel Prize Award Ceremonies



لە ١٠ ی کانوونی یەکەمدا براوەکانی خەڵاتی نۆبڵ لە ستۆکهۆڵم و ئۆسلۆ کۆدەبنەوە، تا مەدالیای خەڵاتی نۆبڵ و دبلۆمی خەڵاتی نۆبڵ و بەڵگەنامەی بڕی خەڵاتی نۆبڵیان پێببەخشرێت، لەلایەن پاشای سوید کارڵ گۆستاڤی شازدەهەم ( Carl Gustaf XVI )ەوە. لە ئۆسلۆ، براوەکانی خەڵاتی نۆبڵی ئاشتی، لەلایەن سەرۆکی دەستەی نۆبڵی ئاشتی و بە ئامادەبوونی پاشای نەرویج شا هارالدی شەشەم (Harald V) وە براوەکان وتەکانی خۆیان پێشکەش دەکەن لە ستۆکهۆڵم و ئۆسلۆ ڕۆژانی پێش بەخشینی خەڵاتەکان.

## بەخشینی خەڵاتی نۆبڵ The Nobel Prize Awarders

کێن ئەوانەی براوەکانی خەڵاتی نۆبڵ دیاریدەکەن؟ لە وەسیەتنامەکەی ئەلفرێد نۆبڵدا کە بە شێوەیەکی سنووردار تایبەتی کردووە بە دامەزراوە بەرپرسەکانی خەڵاتی نۆبڵ، ئەکادیمیای پاشایەتی سوید بۆ زانست (Royal Swedish Academy of Sciences) بۆ خەڵاتی نۆبڵ لە فیزیا و کیمیادا، پەیمانگای کارۆلینسکا (Karolinska Institute) بۆ خەڵاتی نۆبڵ لە نوژداری و فیسیۆلۆژیدا، ئەکادیمیای سوید (Swedish Academy) بۆ خەڵاتی نۆبڵ لە وێژەدا، دەستەیەکی پێنج کەسی کە پەرلەمانی نەرویژ (Storting)ی هەڵیدەبژێرن بۆ خەڵاتی نۆبڵ لە ئاشتیدا. لە ساڵی (١٩٦٨) دا بانکی ناوەندی سوید (Riksbank Sveriges) لە ساڵ یادی ئەلفرێد نۆبڵ و یادی ٣٠٠ ساڵەی دامەزراندنی خۆیدا، خەڵاتێکی بۆ زانستی


Prisen för fysik och Kemi utdelas af Svenska Veten-
skapsakademien; för fysiologiska eller medicinska
arbeten af Carolinska Institutet i Stockholm; för lite-
ratur af Akademien i Stockholm samt för fredsför-
fäktare af ett utskott af fem personer som väljas
af Norska Stortinget. Det är min uttryckliga
vilja att vid prisutdelningarne intet afseende
fästes vid någon slags nationalitetstillhörighet
sålunda att den värdigaste erhåller priset an-
tingen han är Skandinav eller ej.

ئابووری تەرخانکرد، ئەکادیمیای پاشایەتی سوید بۆ زانستی دیاریکرد بۆ دەستنیشانکردنی براوەی ئەم بوارە، بەخشینی ئەم خەڵاتە پێی. لە ساڵی ١٩٦٩ دا بۆ یەکەم جار بەخشرا.



## خەڵاتی نۆبڵ The Nobel Prize



لە ساڵی ١٩٠١ ەوە دەبەخشرێت لە بوارەکانی فیزیا، کیمیا، وێژە، نوژداری، ئاشتی، لە ساڵی ١٩٦٩ شەوە ئابووری، خەڵاتی نۆبڵ خەڵاتێکی جیهانییە کە دەگەڕێتەوە بۆ دامەزراوەی نۆبڵ لە ستۆکهۆڵمی سوید، کە مەدالیا، دبلۆمێکی کەسێتی، خەڵاتێکی ماددی، لە خۆدەگرێت.

## بانگهێشتی نۆبل Nobel Banquet

| سەدەیەك لە مێژووی چێشت لێنان | |
|---|---|
| ڕێوڕەسمی خەڵاتی نۆبڵ هەموو ساڵێك لە ١٠ی کانوونی یەکەمدا لە ساڵی ١٩٠١ ەوە بەردەوام سازدەکرێت، کە ئێستا بۆتە شتێکی گەورە نەك لەلایەن ئەو کەسانەی کە دەرفەتی بەژدارکردنیان پێدراوە و بانگهێشتی ڕێوڕەسمەکە کراون، بەڵکو لای زۆرینەی خەڵکی کە بە هۆی شاشەی تەلەفیزیۆنی ماڵەکانیانەوە چاودێری دەکەن، لە ڕۆژنامەکاندا دەربارەی دەخوێننەوە. |  |
| میوانان<br>لە ساڵی ١٩٠١ دا ١١٣ میوان ئامادەی ڕێوڕەسمەکە بوون. پاش دوو ساڵ یەکەم ژن ماریا کوری لەگەڵ مێردەکەیدا بۆ وەرگرتنی خەڵاتی نۆبڵی فیزیای ساڵی ١٩٠٣ ئامادەبوو، خەڵك زۆر بە گرنگییەوە هەوڵیاندا بەژداری ڕێوڕەسمەکە بکەن، ژمارەی میوانان زیادی کرد |  |

بۆ ١٥٠ کەس و بۆ ٣٥٠. ئەمرۆ نزیکەی ١٣٠٠ میوان. لە نێویاندا ئەندامانی ئەکادیمیاکانی رۆشنبیری و حکومی و کەرتی پیشەسازی، دبلۆماتەکان، و خێزانی پاشایەتی سوید...هتد ئامادەی رێورەسمەکە دەبن.

شوێنەکان



هۆڵی ماریای هۆتێلی گەورەی ستۆکهۆڵم وەك جێگەیەك لە ساڵی یەکەمەوە تا ساڵی ١٩٢٩ بەکارهات. پاش ئەوە گوێزرایەوە بۆ هۆڵی شاری ستۆکهۆڵم " Gyllene Salen" یان هۆڵی ئاڵتونی بە مەبەستی دابینکردنی شوێنی میوانی زیاتر. هۆتێلی گەورەی ستۆکهۆڵم میوانداریيەکەی کرد لە ساڵانی ١٩٣١ بۆ ١٩٣٣، پاشان گەڕانەوە بۆ هۆڵی ئاڵتونی هۆڵی شاری ستۆکهۆڵم ساڵی ١٩٣٤، لە کاتی ڕاپەڕینی هەنگاریادا ساڵی ١٩٥٦ ئێوارە خوانی نۆبڵ گۆڕا بۆ ژەمێکی سووك لە ئەکادیمیای سوید. لە ساڵی ١٩٧٤ هۆڵی شین، هۆڵی شاری ستۆکهۆڵم کە هەتا ئەمرۆ لەوێ بەردەوامە.

خواردن



کۆبوونەوەی ئەم ژمارە زۆرە پێویستی بە کارێکی زۆر قورس هەیە، کە پێویستە هەموو شتێك لە شوێنی خۆیدابێت. لە هۆڵی نان خواردنەکەدا بەڕێوەبەری هۆڵەکە ئامادەدەبێت، سەرۆکی گەورەی چێشت لێنەرەکان، ٨ سەرۆکی کارگوزاران، ١٢٠ کارگوزاری ژن و پیاو، ٥ کارگوزاری شەراب، ٢٠ چێشت لێنەر، نزیکەی ١٢٠ لێپرسراوی قاپ شتن و گواستنەوەی خواردنن. ئەرکی جێبەجێکردن و ڕاپەڕاندنی کارەکانیان لە ئەستۆدایە. لیستی کڕینی



خواردن بۆ ١٣٠٠ کەس ئەمانە لە خۆدەگرێت. ٢٦٩٢ سنگی کۆتر، ٤٧٥ کلکی قرژاڵی ئاوی، ١٠٠ کیلۆگرام پەتاتە، ٧٠ لیتر ساسی توترکی تیژ و شیرین و سرکە، ٦٧ کیلۆ گرام artichokes * ی قودس، ٥٣ کیلۆگرام پەنیری فیلادیلفیا، ٤٥ کیلۆ گرام سەلەمۆن، لیستەکە ئەگەری درێژترکردنەوەی هەیە. بەر لە سێ رۆژ لە رۆژی گەورە، کارکردن و ئامادە کاری دەستپێدەکات هەر کەسێك و بە پێی خشتەی دیاریکراوی بەرنامەی کارەکەی.

کاتی خواردنی نۆبڵ



لە ماوەی ساڵانی سەرەتادا میوانان دادەنیشتن لە سەر مێز کە رێکخرابوو لە شێوەی ناڵی ئەسپدا، ئەمرۆ مێزی درێژ پێویستە . مێزی شەرەف لە ناوەڕاستی هۆڵەکەدایە. رۆژی ئێوارەی نۆبڵ لە هۆڵی شین، ٦٥ مێز لە شوێنی تەواودا هەیە، ٤٧٠ مەتر لە سفرەی راخراو،٣٠ کەس کە دەستکێشی سپیان لە دەستایە دەست دەکەن بە دابەشکردنی ٦٧٣٠پارچە خەزەف، ٥٣٨٤ پەرداخ، ٩٤٢٢ پارچەی پێویستی سەر مێزەکان، جا مێزی شەرەف بێت یان ئەوانی تر. لە ساڵی (١٩٩١)ەوە دامەزراوە نۆبڵ داوای کرد، کە کاتی خواردن دابڕێژرێت تایبەت بە ئاهەنگی نایابی خەڵاتی نۆبڵ لە کاتی گونجاودا. کە وێنەی رۆشنبیری سویدی پێچەوانە بکاتەوە

دابەشکردن



هەر مێزێك دابەشکردنێکی دیاریکراوی هەیە، بۆ جوانکاری و خۆشی ئەو ئێوارەیە. بە گوڵی رەنگ جیا، ئەم گوڵانە بەدرێژای رێگا دێن لە سان رێمۆوە کە ناوەندی رواندنی گوڵە لەسەر کەناری ریڤێرای ئیتاڵی،

| | |
|---|---|
| کە ئەلفرێد نۆبڵ ساڵەکانی کۆتایی ژیانی لەوێ بەسەربرد، وەك ڕێزێك بۆ ئەو یادە (ئەزیندا دی برۆمۆزیۆن توریستکا دی سان ڕیمۆ) Azienda di Promozione Turistica di San Remo دەیبەخشێت، گوڵەکان کە بە جوانی ڕێکخراون لە لایەن کەسانی زۆر شارەزای باوەڕپێکراوی بواری گوڵەوە.. هەموو ساڵێك ٢٣٠٠٠ گوڵ بەکاردێت وەك جوانکاری لەم بۆنەیەدا. | |
| لیستی خواردن<br>لیستی خواردن بێگومان گرنگە لە ئێوارە خوانی نۆبڵدا، لە ئەیلولی هەموو ساڵێکدا سێ لیست پێشکەش دەکرێت لە لایەن گەورە چێشت لێنەرانی هەڵبژێردراو بە وەرەقەی ئیعتمادی نێودەوڵەتی پێشکەش دەکرێت بە دامەزراوەی نۆبڵ تا تاقی بکرێتەوە. لیستی هەڵبژێردراو بە نەزانراوی دەمێنێتەوە تا ڕۆژی راستەقینەی ئێوارە خوانی نۆبڵ. |  |
| * artichokes (الخرشوف)، ئەم جۆرە ڕووەکە لە کوردستان نییە بۆیە بەکوردی ناتوانین وەریبگێڕین. |   |



## چەند لایەنێکی هۆڵەکانی پێشکەشکردنی لێکچەر و نان خواردن و ڕێوڕەسمی ئاهەنگی بەخشینی خەڵاتی نۆبڵ

| | |
|---|---|
| هۆڵی لێکچەرەکانی ئاولا ماگنا (Aula Magna)، زانکۆی ستۆکهۆڵم لێکچەرەکانی نۆبڵ بۆ فیزیا و کیمیا و ئابووری، لێرەدا براوەکانی خەڵاتەکانی ئەم بوارانە پێشکەشی دەکەن. |  |
| هۆڵی لێکچەری ئادەم (Adam)، پەیمانگای کارۆلینسکا لێکچەری نۆبڵ بۆ نۆژداری و فیسیۆلۆژیا، لێرەدا پێشکەش دەکرێت، لە لایەن کەسی براوەی خەڵاتەکەوە. |  |
| بۆرسالین (Börssalen) لە ئەکادیمیای سوید، لێکچەری نۆبڵ بۆ وێژە لێرەدا پێشکەش دەکرێت، لە لایەن کەسی براوەی خەڵاتەکەوە. |  |
| ئامادەکاری ساتێکی کەم بەرلەوەی میوانەکان بگەنە شوێنی نان خواردن. |  |
| کاتی گەشتنی میوانەکان بۆ سەر مێزی نانی ئێوارە. |  |

| | |
|---|---|
| پێشکەشکردنی شیرینی بەر لە نان خواردن. |  |
| هۆڵی پێشکەشکردنی نانی ئێوارە وێنەکەی لەسەرەوە گیراوە. |  |
| دەرەوەی هۆڵی ئاهەنگی مۆسیقای ستۆکهۆڵم. |  |
| ڕێورەسمی بەخشینی خەڵاتی نۆبڵ. |  |
| ڕێورەسمی بەخشینی خەڵاتی نۆبڵ هۆڵی ئاهەنگی مۆسیقای ستۆکهۆڵم. |  |
| ڕێورەسمی خەڵاتی نۆبڵی ئاشتی، هۆڵی شاری ئۆسلۆ. |  |



| | |
|---|---|
| داگرساندنی مۆمەکان ساتێکی کەم بەر لە گەشتنی میوانەکان. |  |
| یەکێك لە لاکانی هۆڵی شین لە کاتی نانی ئێوارەدا. |  |
| ئاهەنگی ڕەقس کردن لە هۆڵی ئاڵتونی. |  |
| لەسەر قادرمەکان پاش نان خواردنی ئێوارە. |  |

## The Magic Call پەیوەندییەکی ئەفسووناوی

چەند خولەکێك بەر لە ڕاگەیاندنی خەڵاتەکە، دامەزراوەکە سەرکەوتووەکانی خەڵاتی نۆبڵ ئاگادار دەکاتەوە بەوەی کە خەڵاتی نۆبڵیان پێدراوە. ئەم بانگەوازە لەوانەیە لە کاتێکی چاوەڕوان نەکراودابێت، ڕەنگە پەیوەندی کردن بە براوەکانی خەڵاتەکەوە لە شوێنێکی چاوەڕوان نەکراودابێت، ئەمە وەبیرهێنانەوەی چەند ساتێکی تایبەتە لە کاتی ئەو پەیوەندییە ئەفسووناوییەدا، گەشتنی ئەو پەیوەندییە ئەفسوناوییە بە براوەی خەڵاتەکانەوە کە خۆیان چاوەڕێی ئەوە نەبوون.

| | |
|---|---|
|  | لە هەوادا Up in the Air<br>ریچارد ئار. ئێرنست Richard R. Ernst، لە فڕۆکەدا بو لە مۆسکۆ، لە لایەن کاپیتانەکەوە ئاگادار کرایەوە کە. خەڵاتی نۆبڵی بۆ کیمیا لە ساڵی ١٩٩١ پێبەخشرا. |
|  | لە دەرەوە لە کاتی شت کڕیندا Out Shopping<br>رینهارد سیلتین Reinhard Selten، لەگەڵ ژنەکەیدابوو شتیان دەکڕی و کەسیان بە دەورەوە نەبوو کە وەڵامی دایەوە . خەڵاتی نۆبڵی ئابووری بۆ ساڵی ١٩٩٤ پێبەخشرا. |
|  | لای پزیشکی ددان At the Dentist<br>گۆنتەر گراس Günter Grass، لای پزیشکی ددان بوو کاتێك پەیامەکەی لە ستۆکهۆڵمەوە پێگەیشت. خەڵاتی نۆبڵی بۆ وێژە لە ساڵی ١٩٩٩ پێبەخشرا. |
|  | لە پۆب At the Pub<br>باری جەی. مارشاڵ Barry J. Marshall، باری پەیامێکی بەپەلەی بۆ هات کە لە پۆپێکی ئوسترالیدابوو . خەڵاتی نۆبڵی بۆ نوژداری لە ساڵی ٢٠٠٥ پێبەخشرا. |



| | |
|---|---|
|  | ئەو پێویستی بە کوپێك قاوە هەیە He Needed a Cup of Coffee<br>ئەمارتیا سین Amartya Sen، گوێی لە تەلەفۆنەکەبوو لە کات ژمێر (٥)ی بەیانیدا لێیدا، و بیری لە ڕوودانی شتێکی ترسناك دەکردەوە. خەڵاتی نۆبڵی بۆ ئابووری لە ساڵی ١٩٩٨ پێبەخشرا. |
|  | لە کۆبوونەوەدا At a Meeting<br>کێسەر میلستین César Milstein، لە ناوەڕاستی کۆبوونەوەدابوو کاتێك پەیامەکەی پێگەیشت. خەڵاتی نۆبڵی بۆ نوژداری لە ساڵی ١٩٨٤ پێبەخشرا. |
|  | لە خانوویەکی دەرەوەی شاردا لە پرۆڤێنس At a Country House in Provence<br>لیڤان ئەلیکسیڤیچ بۆنین Ivan Alekseyevich Bunin، پەیوەندییەکی تەلەفۆنی پێگەیشت لەماڵێکی دەرەوەی شار لە شارۆچکەی پرۆڤێنسی دێریندا. خەڵاتی نۆبڵی بۆ وێژە لە ساڵی ١٩٣٣ پێبەخشرا. |
|  | لە ماڵەوە At Home<br>جێمس ئێم. بوچانان James M. Buchanan، پلانی دانا بوو بۆ بەسەربردنی کات لەگەڵ ژنەکەی لە شوێنێکی وڵاتەکەی، کاتێك پەیوەندییەکی تەلەفۆنی لە ستۆکهۆڵمەوە بۆ هات. خەڵاتی نۆبڵی بۆ ئابووری لە ساڵی ١٩٨٦ پێبەخشرا. |
|  | جارێکی تر بیڵێرەوە؟ Say That Again؟<br>لویس جەی. ئاگنارۆ Louis J. Ignarro، کاتێك پێیان وت کە خەڵاتی نۆبڵی پێبەخشراوە، ئەو پرسیاری کردەوە لەگەڵ ئەوەی بە باشی گوێی لێبوو. خەڵاتی نۆبڵی بۆ نوژداری لە ساڵی ١٩٩٨ پێبەخشرا. |
|  | تۆ پێویستە گاڵتە بکەیت! You Must Be Joking!<br>ویلیام ئێف. شارپ William F. Sharpe، لەو باوەڕەدا بوو کە نوکتەبێت کە پەیوەندییە تەلەفۆنییەکەی بۆ هات. خەڵاتی نۆبڵی بۆ ئابووری لە ساڵی ١٩٩٠ پێبەخشرا. |

| | |
|---|---|
|  | ئەو پێویستی بە هەندێك پشتڕاستكردنەوە هەیەHe Needed Some Proof<br>جێمس ئەی. میرلیس James A. Mirrlees، بە شێوەیەكی جوان پرسی بۆ هەندێك پشتڕاستكردنەوە كاتێك پەیامەكەی وەرگرت. خەڵاتی نۆبڵی بۆ ئابووری لە ساڵی ١٩٩٦ پێبەخشرا. |
|  | بە دەنگێكی گڕەوە In Pitch Blackness<br>ڕۆی جەی. گلاوبەر Roy J. Glauber، شتەكان ناجێگیربوون بە پلەیەكی زۆر بەرلەوەی باشبن، لە ڕووبەڕووبوونەوە تەلەفۆنییەكەدا تیامابوو. پەیامەكەی وەرگرت لە ٣٦، ٥ خولەكی بەیانیدا. خەڵاتی نۆبڵی بۆ فیزیا لە ساڵی ٢٠٠٥ پێبەخشرا. |
|  | ئیلفرید جیلینك Elfriede Jelinek، ئەو ڕۆژەی پەیامەكەی پێگەیشت لە ئەكادیمیای سوید لە ستۆكهۆڵم هاتبووەوە. خەڵاتی نۆبڵی بۆ وێژە لە ساڵی ٢٠٠٤ پێبەخشرا. |



## ڕێگای پۆشین Dress Code



ئەگەر تۆ داوایەكت هەبوو بۆ ئامادەبوون لە ئێوارەی خەڵاتی نۆبڵدا چی لەبەر دەكەیت.

پۆشینی هەڵە بۆ ئامادەبوون لە ڕیوڕەسمی خەڵاتی نۆبڵدا دەبێتە مایەی بێزاری. لە ڕێوڕەسمەكانی ئۆسلۆ و ستۆكهۆڵمدا. پیاوان دەبێت چاكەتی ڕەش و كەمێك درێژ و خانمانیش عەزی كورت یان درێژ بپۆشن.

بۆ خانمان كە میوانن لە ستۆكهۆڵم. هەڵبژاردنەكەی بۆ ئێوارە هیچ پابەندییەكی لەسەر نییە بۆ ڕەنگ و جۆری درونی جلەكانی جانتا و جانتای دەستی و مجەوهەرات و جووتێك پێڵاوی نایاب و دەسكێشیش. كە دەتوانی بیپۆشی بە خواستی خۆتە.

بۆ پیاوان كە میوانن لە ستۆكهۆڵم، چاكەتی ڕەش و پانتۆڵی ڕەشیش و كراسی سپی و بۆیمباخی سپی دوولا و هێڵەكی كورتی سپی لەسەر كراسەكە و قۆنەرەی ڕەش دەپۆشن. لە ڕێوڕەسمی دابەشكردنی خەڵاتەكەدا بەم شێوەیە بەژداربووان پۆشاك دەپۆشن.



مەلیکە سیلڤیا Silvia لە ڕێوڕەسمی خەلاتی نۆبلی ٢٠٠٧ دا

## ڕووداوێکی دەگمەن:

ڕووداوێکی دەگمەن کەلە کاتی بەخشینی مەدالیای خەلاتی نۆبڵدا ڕوویدا بەم شێوەیە بوو براوەکانی خەلاتی نۆبلی ئابووری ساڵی ١٩٧٥ کە لیونید ڤیتالیڤیچ کانتۆرۆڤیچ Leonid Vitaliyevich Kantorovich، لە ئەکادیمیای زانستی مۆسکۆی ڕوسی، و تجالین سی. کۆپمانس Tjalling C. Koopmans، لە زانکۆی یاڵی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکی بوون، کە مەدالیاکەیان تێکەڵ (گۆڕابوو) ببوو لە ستۆکهۆڵم لە کاتی بەخشینیدا، پاش هەفتەیەك لە بەخشینی خەلاتەکان براوەکان گەڕانەوە بۆ وڵاتەکانیان، ئەم ڕووداوە لە کاتی جەنگی ساردداببوو، بۆیە چوار ساڵ کاری دبلۆماسی ویست تا مەدالیاکان ئاڵوگۆڕکران و درانەوە بە خاوەنە ڕاستەقینەکانیان.

## لە ماوەی ساڵانی بەخشینیدا:

خەلاتی نۆبڵ توشی ڕەخنەی ژمارەیەك کەس بۆتەوە، هەندێك کەس وایدەبین کە بڕی خەلاتەکە و ئەو ناوبانگەی کە هەڵیگرتووە بۆ براوەکان زۆر زیاترە لەو کارەی کە ئەنجامیانداوە کە پاشتر خەلاتەکەی دەست دەکەوێت. ئەمەش لە ساڵی ١٩٧٣ دا بوو کاتێك کە خەلاتی نۆبلی ئاشتی بەخشرا بە هنری کسنجەر Henry Kissinger، کە بۆ ماوەیەك وەزیری دەرەوەی ئەمریکابوو، کسنجەر ئەم خەلاتەی بردەوە لەبەر ئەوەی هەوڵیدا بۆ گەڕانەوەی ئاشتی



بۆ ڤێتنا، بەڵام کارەکەی بەو شێوەیە نەبوو کاتێك جەنگ بۆ ماوەی دوو ساڵی تر بەردەوام بوو لە ڤێتنام پاش وەرگرتنی خەلاتەکە لەلایەن کسنجەرەوە.

ڕەخنەیەکی تر خەلاتێك تەرخان نەکراوە بۆ بیرکاری (ماتماتیك) کە ماتماتیك فیزیای گۆڕیوە، لە کاتێکدا پەیوەندیدارن پێکەوە بە بەردەوامی. چیرۆکێك هەیە لەسەر ئەوەی کە نۆبڵ بۆچی خەلاتێکی بۆ ئەم بوارە تەرخان نەکردووە. دەیگێڕنەوە بۆ ئەوەی کە نۆبڵ ژنێکی خۆشویستوە و ناپاکی لەگەڵ کردووە و عاشقی زانای ماتماتیکی بەناوبانگ گۆستاڤ میتاگلفلر بووە، بەڵام تاچەندە ئەم چیرۆکە ڕاستە؟ سەرەڕای ئەوەی نۆبڵ بە درێژای ژیانی ژنی نەهێناوە.

هەر چۆنێك بێت نۆبڵ خەلاتێکی بۆ ماتماتیك تەرخان نەکردووە، بە هۆی ئەوەی کە خۆی زۆر حەزی لە ماتماتیك نەبووە، و لە سەردەمی ئەویشدا ماتماتیك بە زانستێکی کردەی دانەدەنرا کە خزمەت بە مرۆڤایەتی بکات. بەوپێیەی دامەزراندنی دامەزراوەی نۆبڵ ئامانج لێی خەلاتی ئەو بەشانە بکات، کە خزمەت بە مرۆڤایەتی دەکەن، لەو سەدەمەدا خەلاتی دیاریکراو هەبوو بۆ زانایانی بواری زانستی ماتماتیك بۆیە نۆبڵ بە پێویستی نەزانیوە.

## لیس پریکس نۆبڵ Les Prix Nobel

### ئایا هیچ ژیاننامەیەکی براوەکان لای دامەزراوەی نۆبڵ هەیە؟



هەر براوەیەکی خەلاتی نۆبڵ بایۆگرافیا (biography)(ژیاننامە) یان سی ڤی (cv) پێشکەش دەکات بە بەشی براوەکانی هەر بەشێکی خەلاتەکە. جا لەلایەن خۆیەوە نووسرابێت یان لەلایەن کەسێکەوە. ساڵانە لە شێوەی کتێبێکدا بەچاپ دەگەیەنرێت بە ناوی لیز پریکس نۆبڵ Les Prix Nobel لەگەڵ لێکچەرەکانیاندا کە براوەکان دەیخوێننەوە.

## راستی براوەکانی خەڵاتی نۆبڵ Nobel Laureates Facts

### چەند داتایەکی بنەڕەتی Some Basicly Data

| | |
|---|---|
| ٨١٦ | جار خەڵاتەکە بەخشراوە |
| ٧٩٣ | کەسایەتی |
| ٢٠ | ڕێکخراو |
| ٣٥ | ژن |
| ٧٥٤ | پیاو |
| ٤٩ | جار نەبەخشراوە |
| ٥٣ | وڵات بەژداربوو |
| ٢ | برا |
| ١٢ | باوك و کوڕ |
| ٢ | باوك و کچ |
| ٢ | دایك و کچ |
| ٨ | ژن و مێرد |
| ٥ | کەس دوو خەڵات |
| ١ | ڕێخراو سێ خەڵات |
| ٢ | کەس خەڵاتەکەیان ڕەتکردەوە |
| ٣١٤ | ١٠٠٪ ی خەڵاتەکە |
| ٢٦٦ | ١/٢ ی خەڵاتەکە بە هاوبەشی |
| ١٦٥ | ١/٣ ی خەڵاتەکە بە هاوبەشی |
| ٤٨ | ١/٤ ی خەڵاتەکە بە هاوبەشی |



## ڕاستییەکانی سەرکەوتووەکانی خەڵاتی نۆبڵ

## Nobel Laureates Facts

| | | | |
|---|---|---|---|
| ویلیام لەورێنس بـراگ William Lawrence Bragg وڵاتـی بـەریتانیا، لـە تەمـەنی ٢٥ سـاڵیدا خەڵاتی نۆبڵی فیزیای ساڵی ١٩١٥ وەرگرت، تا ئێستا بچووکترین کەسایەتییە لە ڕووی تەمەنـەوە کـە خەڵاتی نۆبڵی وەرگرتبێت. | | | |
| لیوند هۆرویز Leonid Hurwicz لـە ویلایەتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا، لـە تەمـەنی ٩٠ سـاڵیدا خەڵاتی نۆبڵی ئابووری ساڵی ٢٠٠٧ وەرگرت، تا ئێستا گەورەترین کەسایەتییە لـە ڕووی تەمەنـەوە کـە خەڵاتی نۆبڵی وەرگرتبێت. | | | |
| خەڵاتی نۆبڵ دووجار بەخشراوە بە | | | |
| جان - پاوڵ سارتر Jean-Paul Sartre | فەرەنسا | وێژە | ساڵی ١٩٦٤ |
| لی دۆس سۆ Le Duc Tho | ڤێتنام | ئاشتی | ساڵی ١٩٧٣ |
| چوار لە براوەکانی خەڵاتی نۆبڵ کە حکوومەتەکانیان ناچاری کردن کە لە خەڵاتەکە دوورکەونـەوە، ئـادۆڵف هیتلەر سێ کەس لە براوەکانی خەڵاتی نۆبڵی بێبەش کرد لە وەرگرتنی خەڵاتەکە کە ئەڵمانی بوون. | | | |
| ریچارد کۆهن Richard Kuhn | ئەڵمانیا | کیمیا | ساڵی ١٩٣٨ |
| ئەدۆڵف فریدریش جۆهان Adolf Friedrich Johann | ئەڵمانیا | کیمیا | ساڵی ١٩٣٩ |
| گێرهارد دۆماك Gerhard Domagk | ئەڵمانیا | نوژداری | ساڵی ١٩٣٩ |
| دەسەڵاتدارانی یەکێتی سۆڤێت یەکێك لە براوەکانی خەڵاتی نۆبڵیان بێبەش کرد لە وەرگرتنی خەڵاتە کە. | | | |
| بۆریس پاستیرناك Boris Pasternak | سۆڤێت | وێژە | ساڵی ١٩٥٨ |
| ئەو کەسانەی زیاد لە جارێك خەڵاتی نۆبڵیان وەرگرتووە. | | | |
| لینۆس کـارڵ پـاولینگ Linus Carl Pauling دوو خەڵاتی نۆبڵی وەرگرتووە لە دوو بواری جیاوازدا. | ئەمریکا | کیمیا<br>ئاشتی | ساڵی ١٩٥٤<br>ساڵی ١٩٦٢ |
| جۆن باردین John Bardeen دوو خەڵاتی نۆبڵی وەرگرتووە لە فیزیادا. | ئەمریکا | فیزیا | ساڵی ١٩٥٦<br>ساڵی ١٩٧٢ |
| ماریـا کـوری Marie Curie، دوو خـەڵاتی نـۆبڵی | فەرەنسا | فیزیا | ساڵی ١٩٠٣ |

